# ئەو دەربەندەی خۆری لێ ناوا نەبوو



وریا یونس

گێڕانەوەو شیکردنەوەی دیوی راستەقینەی
رووداوەکانی داستانی کۆڕێ ١٩٩١

# ئەو دەربەندەی خۆری لێ ئاوا نەبوو

**گێرانەوەو شیکردنەوەی دیووی راستەقینەی ڕووداوەکانی داستانی کۆرێ**

**وریا یونس**

ناوی پەرتوك : ئەو دەربەندەی خۆری لیٚ ئاوا نەبوو

نوسینی: وریا یونس

تایپ : نوسەر

تیراژ : ١٢٠٠ دانە

نرخ : ٣٠٠٠ دینار

ژمارەی سپاردن: ( ٢٦٢ ) ٢٠١٣

چاپخانەی : كەكۆن CACON - سلێمانی

دیزاین: مراد قادر بەهرامیان

لەبەرێوەبەرایەتی گشتی كتێبخانە گشتیەكان ژمارەی سپاردنی( ٢٦٢) ی سالی(٢٠١٣)ی پێدراوە

# پێشکەشە

- بەو شەهید و پێشمەرگە قارەمانانەی کە بوێرانە
لەدەربەندی کۆرێ بەرەنگاری دوژمنانی خاکەکەیان وەستانەوە

- بەسەرجەم شەهیدانی کوردستان

# پێرست

# پێشەکی

پانتاییەکی فرە لە مێژووی گەلی کورد بە نادیاری یاخود بە هەڵە و کەم و کورتیەکی زۆرەوە ماوەتەوە, ئەمەش کاریگەریەکی یەکجار زۆری کردۆتە سەر کەلتور و دامەزراندنی بیرێکی ناسیۆنالیستی. هەرچەندە لە ئێستاو لە رۆژگاری ئەمرۆدا زۆر ئەستەمە کەبتوانین هەوڵی ڕاست کردنەوەودۆزینەوەی ئەم رووبەرە گەورەیەی مێژوومان بدەین, بەلآم ئیش کردن و ڕۆچوون بەقولآیی لێوارەکانیشی دا نزیك مان دەکاتەوە لەو تولە رێگایەی دەمانگەیەنێتە تروسکایی. بۆیە دۆزینەوە و ڕاست کردنەوەی مێژوو بەمانایەکی تر چوونەوە ناو مێژوو لە رێگەی بیرێکی ناسیۆنالیستی زانستی بەگرێدراو بە کۆمەڵگایەکی یەکگرتوو ئامانجێکە زۆر لە پێشترە لەخەبات لەپێناوی ڕزگاری و سەربەخۆیی دا .

کێشەی هەرە گەورەی ئێمە لە بیر کردنی ڕووداو و گوێ نەدانە بەو ساتە مێژوویانەی کە بۆ ئێمە زۆر گرنگ و هەستیارن. من لێرە دا بەتەنیا باس لەمێژووی کۆنی چەندین ساڵە ناکەم, بەڵکو مەبەستیشم بەتایبەتی بە دیکۆمێنت کردنی مێژووی نوێی خۆمانە, مێژوویەك ئەگەر هەر لەسەرەتای دروست بوونی شۆرشی ئەیلولیشەوە دەست پێ بکەین هەتا ئێستا بەو هەموو ڕووداو و کارەساتانەوە بەتراژیدیا و ساتە کامەرانیەکانمانەوە پڕیەتی لە هەڵەو کەم و کورتی. هۆکارەکانی ئەم تەنگژەیە زۆرن و ئامانجی ئەم کتێبە نیە, بەلآم جەخت کردنەوەی ئەم مەسەلەیە ( تراژیدیای بە دیکۆمێنت کردنی مێژووی کورد) لەهەموو ساتێکدا پێویستیەکی ئەوەندە گرنگە کە هاوجووت دەبێتەوە لەگەڵ تێکۆشان لەپێناوی ئازادی دا. بەڕاستی کارەساتە ڕووداوەکانی دوێنێ ئاوا بەو شێوەیە بزر دەبن و بە شێوەیەکی هەڵە لە بەرژەوەندی تاکەکەسی یان حزبیەوە بە دەق دەکرێن. هەموو باسێك لە سەر ڕوداوەکان, سەرکەوتن و نوشوستەکان تەنانەت کەلتور و ژیانی ڕۆژانەی رابوردوشمان تەمێکی چڕ

داپۆشیوە. کاری من لەم کتێبەدا ئیش کردن نیە لەسەر لابردنی ئەم تەمە لەسەر مێژوو, بەڵکو هەوڵ دانێکە تا بانگەێنێتە سەر زانستی بە بەدەق کردنی ڕووداوێکی مێژووی لە ڕێگەی نوسینەوە و گێرانەوەی داستانی شەڕی کۆڕێ.

بەڕای من شەڕی کۆڕێ یەکێکە لە هەرە داستانە گرنگەکانی تێکۆشەرانی ڕێگای رزگاری دژی حکومەتی دیکتاتۆری عێراق. نوسینەوەی ڕووداوێکی وا و هەوڵدان بۆ بە دیکۆمێنت کردنی لە چوارچێوەی ڕاستی بەسەر هاتەکان کارێکی یەکجار ئەستەمە, پڕیەتی لەماندووبون و کار کردنی بەردەوام بەتایبەتی ڕووداوێك کەتیایدا بتەوێت کاراکتەرە زیندوەکانی خۆیان بێنە قسەو پەلکێش بکرێن بۆ ناو خەیاڵ و یادەوەری ڕۆژانی بەسەر هاتەکە پێش لە یاد چونەوەیان. لەگەڵ ئەوەدا مەبەستی نوسینی ئەم کتێبە بەتەنیا ئاشکراکردن و گێرانەوەی ڕاستی ڕووداوەکە نیە بەڵکو خستنە ڕووی فۆرمێکی نوێشە لە نوسینەوەی مێژوو لە دیدگایەکی زانستیەوە .

سالی ۱۹۹۱ گۆڕینی وەرچەرخانێکی یەکجار گرنگە لە مێژووی نەتەوەی کورد کە پێك هاتبووە لە گۆرانکاری هەمەجۆری خۆشی و ناخۆشی, هەر لە بەهاری ئازادی و ڕەش بەڵەکی سەرکەوتنەوە هەتا کۆڕەو و کوشتارو ماڵوێرانی کورد. بۆیە مێژووی ئێمە لەدوای ئەو ساتانەوە ڕەنگ و شێوەیەکی تری لە خۆ گرت کە بۆیەکەم جار بەشێوەیەکی سەرکەوتوویی درێژ جەماوەری کوردستان لەگەڵ بزوتنەوەی سیاسی کورد لە ناو خاکی کوردستان یەك جەستەیی دوور لە فەرمانڕەوایی بێگانە توانیان دەسەلاتێکی سەرکەوتوو بەدەست بێنن. سەرەتای دەرگا کردنەوەی گۆڕنکاریەکان لە داگیرکردنی کوێتەوە دەستی پێکرد پاشان ڕاپەڕین وکۆچ ڕەو و شەڕی کۆڕێ هەتا ئەو دامەزراندن و جێگیر بونەی دەسەلاتی سیاسی کورد کە هەتا ئەمڕۆش بەردەوامی هەیە و ڕۆژ بە ڕۆژ لە پێشکەوتن دایە. بۆیە ئەم ڕووداوانە زۆر گرنگن بۆ گەلی کورد بەتایبەتیش ڕاپەڕین و کۆڕەو کە گەورەترین دوانەی ڕووداوی مێژوویی گەلی کوردن بەهەمان کات کاریگەریەکی یەکجار بەهێزی هەبووە لەسەر بیری

نەتەوەیی و هەستی بەکورد بوون. ئەگەر چی ڕووداوە ناخۆشەکانی شەڕی براکوژی ئەم هەست وبیرەی بەرەو کاڵ بونەوە و لەق بوون برد, بەلاّم لەناکام دا هەمەئاهەنگیەکی نەتەوەیی ووشیارانە دروست بووە. ڕاپەرین و کۆچ ڕەو گرنگ ترین ڕووداوی مێژووی ئێمەن کە بەدەق نەکراوەو بەشێوەیەکی ترسناك پشت گوێ خراوە, بەجۆرێك لە یادی سالانەوە و بەیاننامەی حزبی دووبارە کراو و بەرژەوەندیە تایبەتیەکان نەبێت هیچ لێکۆڵینەوە و بەدواچوونێکی زانستیانەی بۆ نەکراوە, ئەوەی ووتراوە دەوترێتەوە ئەوەی نوسراوە دەنوسرێتەوە بەشێوازێکی سیاسی رووتی بێزار کەر. لەناو منداڵانی ڕاپەرین و کۆڕەو دا شەڕی بەرگری کۆڕێ لەدایك بوو, شەڕی نێوان بەرەی کوردستانی و سوپای عێراقی. هەڵبەتە لەهیچ کاتێك دا شەڕ و بەرەنگاری یان پێکدادانە سەربازی و پارتیزانەکان دڵخۆش و چارەسەر نەبوون بۆ کورد. شەڕ هەمیشە ماڵ وێرانی و نەهامەتی بەدوای خۆیدا هێناوە, لە هەمان کات کورد بە ناچاری نەبێت هەرگیز شەڕی هەڵنەبژاردوە بەلاّم بەهۆی زۆرداری لەڕادەبەدەری ڕژێمی عێراق جەنگەکان بەتایبەتی سەرکەوتنە مەزنەکانی هێزی پێشمەرگە لە شەڕی چەکداری دا بو نەتە شانازی مەزنی مێژووی بۆ گەلی کورد. شەڕی بەرگری کۆڕێ لە ئەپریلی ١٩٩١ یەکێکە لەو شانازیە مێژوویەی کە هێزی پێشمەرگەی کوردستان توانیان هێرشی سوپای عێراق تێك بشکێنن . لێرەدا من ئەمەوێت ئاماژە بەچەند هۆکارێکی گرنگ بکەم کەدەیسەلمێنێت داستانی کۆڕێ شەڕێکی نموونەیی و مێژووییە دەبێت لە بیر نەکرێت , هەروەها بە شێوەیەکی ڕاستی و دوور لە بەرژەوەندی تایبەتی بنوسرێتەوە و تۆمار بکرێت. یەکێك لە هۆکارە گرنگەکان بەشدار بوونی کردەکی سەرتاپای حزبەکانی بەرەی کوردستانیە بۆ یەکەم جار لە شەڕێکی وا دا کە ڕژێم هەموو قورسایی خۆی خستبووە سەر بۆ سەرکەوتن .

دابەشبوونی ئەو هەموو حزبە لەسەنگەرەکانی پێشەوەدا شان بەشان و بە هاریکاری یەکتری وێنەی کەمە لە مێژووی ئێمەدا, بەتایبەتی کە مێژووی پارت و

بزوتنەوەی سیاسی کورد هەتا سالآنێکی کەمی بەر لە شەڕەکە لێـواو لێـو بـوو لـە ململانێی چەکداری و شەڕی یـەکتر کوشـتن و یـان قبـول نـەکردنی یـەکتر. کاتێـك لەشاخەکانی کۆڕێ پێشمەرگەیەکی ئیسلامی شان بەشانی پێشمەرگەیەکی شـیوعی بۆ یەك نامانج دەجەنگن و لە تەنیشت یـەکترەوە شـەهید و برینـدار ئـەبن, راسـتی گرنگی ئەم شەڕەمان بۆ دەسەلمێنێ, ئـالێرەدا بـیری نەتـەوەیی و گیـانی نیـشتیمان پەروەری لە دایك دەبێت. بۆیە شەڕی کۆڕێ پێمان دەلێت بەبێ لەدەستدانی فرەیی بیر و ئایدۆلۆژیەکان یەککگرتن و سـەرکەوتن رێگایـەکی سـەخت نیـە, تەنانـەت چـەندە ووتاری سیاسی حزبی جیاواز بێت و چەند جەمسەر بێت. لەلایـەکی تـرەوە یـەکێك لەهۆکارەکانی تری گرنگی شەڕی کۆڕێ ئەوەیە بەشکاندنی سـوپای ڕژێـم بەدەسـتی هێزی پێشمەرگە حکومەتی عێراقی مـل کـەچ کـرد بـۆ بانگـەوازکردنی ئاشـتی و دانووستان لەگەڵ کورد, ئەو حکومەتە دڕندەیەی کە لـەو کاتـەدا داخێکـی گـران و ڕەشی دۆڕاندنی شەڕی کوێـت وراپـەڕینی لـەدڵ دابـوو .هـەروەها شـەڕی بـەرگری پێشمەرگە کاریگەریەکی بـەهێزی پـۆزەتیفی کـردە سـەر ووتـاری سیاسـی کـورد.

بۆ نوسین و خستنە ڕووی ڕاشـکاوی شـەڕی کـۆڕێ لـە سـەرەتادا هـەوڵم داوە بەشێوەیەکی خێرا هەموو ئەو گۆڕانکـاری و ڕووداوانـە بـاس بکـەم کـە پەیوەنـدی پتەویان هەبوە لە گەڵ شەڕەکە یان بوونەتە هۆی دروست بوونی, هەر لە داگیر کردنی کوێت لەلایەن عێراقەوە هەتا ڕاوەستانی شەڕی کۆڕێ و دانووستان لـەنێوان کـورد و ڕژێم, چونکە ئەو ڕووداوانە وەك ئەڵقەیـەکی پـۆلآین بەسـتراونەتەوە بەیـەکتری, بـۆ نموونە" داگیر کردنی کوێت ڕژێمـی عێراقـی دووچـاری دۆڕانـدن و شکـست هێنـانی سەربازی کرد کە ڕاستەوخۆ کاریگەری کردە سـەر ڕاپـەڕین و ئـازاد کردنـی شـارو شاروچکەکانی کوردستان , لەهەمان کات شالآوەکانی ڕژێم بۆ گرتنـەوەی شـارەکان, کۆچ ڕەوی جەماوەری دروست کرد و لە ناو قولایی کۆچ ڕەویـش دا شـەڕی بـەرگری کۆڕێ وەك بەرپەرچ دانەوەی داگیر کردنەکان هاتەکایەوە, هەروەها بەشکاندنی ڕژێـم

لەم شەڕەدا دانووستاندن لە نێوان کـورد و ڕژێـم دەسـتی پێکـرد. بۆیـە نیـشاندان و باسکردنی ڕووداوەکان بەپێی ڕێز بەندی قۆناغەکان وێنەیەکی ڕوونی سەرتاپا گیرمـان نیشان ئەدات دەربارەی هۆکار و ئاکامی شەڕەکە لەگـەڵ ئـەوەش دا تێگەیـشتنمان ئاسانتر دەکاتەوە بەرامبەر هـەموو ڕووداوە گرنگـەکانی سـالی ١٩٩١, کەبەسـالی بوومەلەرزەی سیاسی کورد ناودەبرێت. لەلایەکی ترەوە نوسینی ئەم کتێبە تەنها بۆ ئـەمڕۆ و بـۆ ئـەو نەوەیـە نیـە کـە زادەی واقیعـی ڕووداوەکـانن و ئاگـاداری بەسەرهاتەکانن. بەڵکو ئەمـە نوسـینەوەی مێـژوو و لێکدانـەوەی ڕووداوە گـەلێکی گرنگن کە چواردەوری داستانی شەری کۆڕێ یان داوە و وەك پـەرتوکێکی مێـژوویی بۆ نەوەکانی داهاتووش بەئەرشیف دەکرێت. ئەوەیەك کە ڕەنگە زۆر ووشیار و ئاگادار نەبێت لە دروست بوون و سەر هەڵدانی ئەو قۆناغە گرنگ و ئـەو داسـتانە مەزنـەی شەری کۆڕێ لەهۆکارو ئاکام و چۆنیەتی دروست بوونی .

خالێکی زۆر گرنگی ئەم کتێبە ئەوەیە کاتێـك دەچـێتە قـولآیی و خوێندنـەوەی بەسـەرهات و چـاوپێکەوتنەکان, دەگەیتـە راسـتی ڕووداوەکـان لـە دەمـی کەسایەتیەکانەوە, هەروەها تێدەگەی زۆربەی نوسینەکانی پێشوو کە دەربارەی شەڕی کۆڕێ نووسراون لە بەرژەوەندی حزبی و تاکە کەسی بـووە . بۆیـە مـن هـەوڵم داوە هەموو کەسایەتی و لایەنـەکان بێنمـە ئاخـاوتن و کاراکتـەرە دیـار و نادیارەکـانی داستانەکە خۆیان بێنە دواندن دوور لە پێـدا هەڵـدان و پروپاگەنـدە کـردن . لەگـەڵ ئەوەدا لە نیشاندانی ڕاستی ڕووداوەکان ئاستەمی یـەك و زەحمەتیـەکی زۆر هاتۆتـە ڕێگام, چونکە زۆر لەکەسایەتیەکانی بەشدار بووی شەڕەکە نەماون , ئەوانەش مـاون ڕەنگە دووچاری لە بیرچونەوەبووبن . بۆیە بۆ هەڵمالینی ڕاسـتی ڕووداوەکـان هـەوڵم داوە پشت بە هونەری پرسیار کـردن و نیـشان دانـی نەخـشەی جوگرافیـای شـوێنی شەڕەکە ببەستم , هەروەها بە بەکارهێنانی تەکنیکی وەبـیر هێنانـەوەی جەمـسەر و ناوەرۆکی شەڕەکە لە کاتی چاوپێکەوتنەکاندا. لە دوومـاهی ئـەم پێـشەکیەدا حـەز

دەکەم ئەوە ڕوون بکەمەوە کە من وەك نوسەری ئەم کتێبـە خـۆم یـەکێك بـووم لـە بەشداربوانی شەڕەکە و بەچاوی خۆم واقیعی شەڕەکەم بینیـوە, کـە ئەمـەش ڕەنگـە هۆکارێك بێت بۆ هەوڵدان و تامەزرۆی بەدواچوونم بـۆ نوسـینی ئـەم کتێبـە, بـەلاّم بەشداربوونم لە شەڕەکەدا بەمانای ئەوە نیە ئاگاداری تەواوی پێکدادانـەکان بـووبم , چونکە شەڕەکە بەر فراوان بوو, بەرەکانی شـەڕ هەمـە لایەنـە بـوو, ئێمـەش وەکـو پێـشمەرگەکانی تـر لـە خالێـك و سـەنگەرێك دا لـە بەرەنگایـدابووین. بەنوسـین و بەدواداچوونی ئەم کتێبە هیوادارم توانی بێتم خوێنەری ئەم داستانە دڵـشاد بکـەم و زانیاریـەکی ڕاسـتی پـێ ببەخـشم کـە ببێتـە دڵنیـا بـوون و ووشـیار کردنـەوەی .

وریا یونس

## داگیر کردنی کوێت... سەرەتایەك بۆ لێکترازانی ڕژێمی عێراق

کۆتایی هاتنی جەنگی هەشت ساڵەی عێراق و ئێران گەڕانەوەی نارامی و خۆش بەختی نەبوو بۆ خەڵکی عێراق, چونکە هەر نەوەندەی پێ نەچوو ڕۆڵەکانی عێراق دووچاری جەنگێکی تری ماڵ وێرانی بوونەوە. ڕژێمی دیکتاتۆری عێراق بۆ بەدیهێنانی ئاواتی لە مێژینەیی کە گەڕانەوەی کوێت بوو وەك پارێزگایەك بۆ عێراق, ڕاستەوخۆ کوێتی تاوانبار کرد بە دزینی نەوتی عێراق , ئەم بیانوەی ڕژێم بەرامبەر دەوڵەتی کوێت (دۆستی لە مێژینەی ) ڕێگەی خۆش کرد بۆ سەرەتای جەنگێکی تر کە پاشان بە شێوەیەکی زۆر خێرا و چاوەڕوان نەکراو پەرەی سەند. سەدام هەمیشە لەو خەیاڵەدابوو کە بەهەرشێوەیەك بێت دەبێ کوێت وەك پارێزگایەك بگەڕێنێتەوە, چونکە کوێت تا جەنگی جیهانی یەکەمیش بەشێکی دانەبڕاو بوو لە خاکی عێراق. بیرۆکەی لکانەوەی کوێت ڕەگ و ڕیشەیەکی کۆنی هەبووە لەلایەن ڕژێمە یەك لەدوای یەکەکانی عێراق, بۆ نمونە :(عبدالکریم قاسمی سەرۆکی عێراق لە ١٩٦٢/٦/٢٥ لە کۆنگرەیەکی ڕۆژنامەنوسی لە بەغدای پایتەخت داوای لکاندنەوەی کوێتی کرد بە عێراق)(١).



عبدالکریم قاسم سەرۆکی پێشووی عێراق

ئەگەرچی کوێت لە ۱۹٦۱/۷/۲۰ وەك ولاتێکی سەربەخۆ دانی پێدانرابوو لەلایەن کۆمەلگای نێو دەولەتیەوە. بۆیە ڕژێمی سەدام لە دوای کوتاهێنانی جەنگی هەشت ساڵەی لەگەل ئێران لە هەولی دۆزینەوەی بیانوێك بوو بۆ داگیرکردنی کوێت. لەگەل ئەوەدا سەدام لە مەترسی و کاردانەوە توندەکانی ئەمریکا دەگەیشت سەبارەت بەم کردارەی بەلام ئەو بۆ بەرپا کردنی جەنگ و جێ بەجێ کردنی پیلانەکانی, بە پێچەوانەوە ناکۆکیەکانی قولترکردەوە ئەم هێستریایەی ڕژێمی عێراق لە مەڕ هەلگیرساندنی شەڕ هۆکاری تریشی لە پشتەوە بوو,

ئەویش لە خۆبایی بوونی سەدام بوو بەوەی کە خۆی بە براوەی جەنگ دەزانی لەگەل ئێراندا, بەهەمان کات عێراق خاوەن سوپایەکی یەك ملیۆن سەربازی بەتوانا و خاوەن ئەزموونی هەبوو کەلە تەواوی ناوچەکە بێ هاوتا بوو. هەربۆیە لەپەلامارێکی کت و پڕو چاوەڕوان نەکراودا لە ۱۹۹۰/۸/۲ حکومەتی عێراق ٤۳,۰۰۰ هەزار سەربازی نارده سەر دەولەتی کوێت و داگیری کرد. ئەم کردەوە سەربازیەی ڕژێم زۆربەی ولاتانی دووچاری سەرسورمان کرد, چونکە لە بیری کەس دا نەبوو کە عێراق لەو قۆناغە ناسکەدا خۆی بخاتە جەنگێکی وا سەختەوە کە لەئاکام دا نارەزایی وکاردانەوەیەکی توند وبەربلاوی بەخۆیەوە بینی. لەیەکەمین بەرپەچدانەوەی ولاتانی زلهێزی جیهانی لە کۆبونەوەکانیان لە نیوۆرك و واشنتۆن و سعودیە داوای ڕسواکردنی ئەم هێرشە و دەست بەجێ پاشەکشەی سوپای عێراقیان کرد لە خاکی کوێت, بەلام عێراق ئەم هەڕەشانەی پشت گوێ خست و لەماوەی دوو ڕۆژدا کوێتی بەتەواوی داگیر کرد و ناوی نا پارێزگای نۆزدەهەم .

کۆمەلگەی نێودەولەتی دەیان بڕیاری لەدژی ئەم داگیرکردنەی عێراق بۆ سەر کوێت دەرکرد, بۆ ئەم مەبەستەش یەکێتی سوڤیەت نوێنەری تایبەتی خۆی (یەڤگینی پریماکۆڤ ) نارده لای سەدام تا ڕازی بکات بە کشانەوەی بەلام بێ سوود بوو, تەنانەت سەدام حسێن سەرەڕای نارازی بوونی بە کشانەوەی لە کوێت پێی

ووتبوو: (لەبیرتانە کەمن لە ١٥ ئابدا دەستم لە هەموو دەسکەوتەکانی جەنگی هەشت ساڵەمان لەگەڵ ئێران دا هەڵگرت و دۆخەکەم وەك پێش جەنگ لێکردەوە، ئەگەر ئەم جارەش بەبێ مەرج لە کوێت بکشێمەوە گەلی عێراق لێم خۆش نابێ، ئەوکاتە خەڵك لێم ئەپرسێ ئەی گەیشتن بە دەریا چی لێ هات )(٢)



*یەڤگینی پریماکۆف*

سەدام لای دۆستەکانی ئەم شەڕەی وا گوزارشت لێ دەکرد کە گوایە وەکو ئەوەی گەلی عێراق داوای کردبێت کوێت داگیربکات, هەربۆیە هەرگیز ئامادە نەبوو بڕیاری کشانەوە بدات. تەنانەت بۆ ئەم مەبەستەش هەردوو زانای ئیسلامی ناوداری جیهانی عەرەبی:

(یوسف قەرزاوی و محەمەد غەزالی) لە نامەیەکیان بۆسەدام کەتیایدا هاتووە:

لە دوای بەشان و باڵ هەڵدانی کە بە بەرهەڵستکاری داگیرکارانی خاکی موسڵمانان ناوی دەبەن, ئینجا داوای لێ ئەکەن بکشێتەوە لە خاکی کوێت بۆ ئەوەی هێزەکانی ئەمریکا و ڕۆژئاوا پێگەی خۆیان بە هێز نەکەن لە ئومەی عەرەبی. (٣)



یوسف قرزاوی



محمد غزالی

بەلام تکا و داواکاریەکانی دۆستان نەیان توانی بیری شەڕانگێزی سەدام بگۆڕن و پاشەکشەی لە خاکی کوێت پێ بکەن. ئەم تاکڕەویەیی ڕژێمی عێراق وایکرد بیرۆکەی جەنگ لە لایەن ولاتانی زلهێزی وەك ئەمریکا و بەریتانیا و هاوپەیمانەکانی ببێت بە تاکە ڕێگایەك بۆ تەمبێ کردنی سەدام و سوپاکەی. سەرئەنجام ئەوەبوو لەکات ژمێر (٣) ی بەرەبەیانی ڕۆژی ١٩٩١/١/١٧لە لایەن ( ژەنەڕاڵ شوارسکۆف) فەرماندەی گشتی هێزەکانی هاوپەیمانان فەرمانی کردەوەی سەربازی گەردەلولی بیابانی ڕاگەیاند, کەسەرەتا بەهێرشی ئاسمانی دەستی پێکرد .

هەر لە یەکەم ساتی ڕاگەیاندنی شەڕدا هێزی ئاسمانی هاوپەیمانان شالاویان چڕکردەوە بۆ سەر بنکە سەربازیەکانی سوپای عێراق و لەسەر ئاسمانی دەشتاییە پان و بەرینەکانی ناوچەکەوە دەستیان کردە گورز وەشاندن, لەماوەی چل و سێ ڕۆژدا هێزە ئاسمانیەکانی هاوپەیمانان (١١٦٠٠٠) هەزار دەرچوونیان کرد بۆ بۆردومانکردنی بنکە سەربازیەکانی سوپای عێراق, کە تیایدا نزیکەی (١٣٠) هەزار تۆن بۆمبی لێزەر و کاتوشە و چەندەها جۆری تری تەقەمەنیان لە عێراق تاقی کردەوە کە زیانێکی یەکجار کوشندەی لێکەوتەوە, لەگەڵ ئەوەشدا جگە لە زیانی

سەربازی خەلکێکی زۆری سڤیلیش بوونە قوربانی, بەتایبەتی لە کاتی بۆردومانە ئاسمانیەکانی هاوپەیمانان بۆ سەر شاری بەغدا.



ژەنەراڵ نۆرمان شوارسکۆف فەرماندەی گشتی سوپای هاوپەیمانان١٩٩١

هەرچەندە ئەمریکیەکان ئەوەندە گوێیان بە زیانەکانی گیانی عێراق نەدەدا, چونکە بەبڕوای ئەوان هێزە هاوپەیمانەکان ئامانجە ستراتیژیە سەربازیەکانیان بەلاوە گرنگتر بوو. سەرەڕای تەفروتوناکردنی هەموو یەکەکانی سوپای عیراقی لە ناو خاکی کوێت, بەلاّم سەرۆکی عێراق هێشتا بڕیاری کشانەوەی نەدا, هەر بۆیە ئەم جارەیان سوپای هاوپەیمانان بە فەرماندەی ژەنەراڵ شوارسکۆف لە رۆژی یەك شەمە ١٩٩١/٢/٢٤ هێرشی زەمینی و ئاسمانی و دەریاییان دەست پێکرد, کە تیایدا هەرچی یەکەکانی سوپای عێراقی هەبوون لەماوەیەکی کورتدا تێك شکێندران و لەناوچوون, هەروەها باری گشتی ناوخۆی عێراق دووچاری شلەژان و پەرتەوازەیی بۆوە. ئەم بارەودۆخە وای لە رژێمی عێراق کرد پاشەکشە بکات لە بڕیاری داگیرکاریەکەی, بۆیە لە ١٩٩١/٢/٢٦ بڕیاری دا لە کوێت بکشێتەوە ,



*هێرشی ئاسمانی هاوپەیمانان بۆ سەر سوپای عێراقی ١٩٩١*

بەڵام هێزی هاوپەیمانان زۆر گوێیان بە بڕیارەکەی عێراق نەدا و بەردەوام بوون لە هێرش بۆ سەر یەکە سەربازیەکانی عێراق, بۆیە لەماوەی دوو ڕۆژ سوپای عێراق دووچاری زیانێکی یەکجار زۆر بوو وە کە تیایدا بە هەزاران سەرباز کوژران, بەتایبەتیش لەکاتی پاشەکشەکردنیاندا لە سەر ڕێگای سەرەکی نیوان هەردو وڵات کە دواتر ئەم ڕێگایە بە **(ڕێگای مەرگ)** ناوی دەرکرد. هەروەها زۆری ژمارەی دیلەکانی سوپای عێراق بەڕادەیەك زۆر بوو وای کردکە **(دیك چینی)** وەزیری بەرگری ئەوکاتی ئەمریکا لە ١٩٩١/٢/٢٤ بڵێ:

(زۆری ژمارەی دیلەکانی عێراق کێشەی بۆ دروست کردووین)(٤) بەگوێرەی سەرچاوە جۆراو جۆرەکانی وەکو: ئاژانسی هەواڵگری ناوەندی ئەمریکا و ڕاپۆرتی ئاژانسی ئەسۆشیتد پرێس و ئاژانسەکانی ڕۆژئاوا زیانەکانی عێراق لە جەنگی کەنداو بەم شێوەیە بوو :.



*سوپا تێکشکاوەکەی عێراق لەسەر ڕێگای کوێت- عێراق ئەو ڕێگایەی بە ڕێگای مەرگ ناسرا*

کوژرانی ٤٥ بۆ ١٠٠ هەزار سەرباز, ٢٥ بۆ ٣٠ هەزار خەڵکی مەدەنی, بریندار بوونی ٣٠٠ هەزار سەرباز, مەدەنی , هەروەها کەوتنە خوارەوە و تێکشکاندنی سەدان فرۆکەی جەنگی (٥). بەگشتی ڕەنگە زیانەکانی عێراق لەم جەنگەدا زۆر لەوە زیاتر بێت بەلاّم دەبێ ئەوە بزانین زیانێکی وا بۆ جەنگێکی وا کورت خایەن زۆرە.

سەدام کەسایەتیەکی شەڕخواز و دڕندە بوو, یەکێك لە پیشە هەمیشەییەکانی گاڵتەپێکرن بوو بە دوژمنەکانی دوور لە لۆجیکی سیاسی, ئەو سوور بوو لە سەر داگیرکردنی ولاّتێکی سەربەخۆ بێ گوێ دان بە هیچ بنەما و بەهایەکی یاسایی و مرۆیی, لەهەمان کات لە هیچ بارێك ئامادەی گفتو گۆ کردن نەبوو سەبارەت بەکێشەکان, ئەو وەك سەرکردەیەکی سەربازی لە کێشەو ململانێکانی دەیڕوانی, کەچی لەڕووی تاکتیکی سەربازیەوە هەر زوو شکستی هێنا و نەیتوانی پارێزگاری لە مانەوەی سوپاکەشی بکات بەتایبەتیش لە دوای کشانەوە لە خاکی کوێت, بۆیە بەم شێوەیە تەواوی سوپاکەی لە کوێت تەفر و تونابوون, تەنها بەشێك لە پاشماوەی سوپاکەی نەبێ لە نێوان ئاگر و مەرگ دا دەربازبوون و گەڕانەوە بۆ عێراق .

له دوای شکسته گەورەکەی سوپای عێراق له ناو خاکی کوێت , شیعەکان له خوارووی عێراق ئەم هەلْەیان قۆستەوە توانیان بەرووی دەسەلاتی فاشیستانەی ئەم رژێمه بتەقنەوە, هۆکاری تەقینەوەی شیعەکانیش له ئەنجامی سەرکوت کردن و له سێدارەدان و بەکوشت دان و وێرانکاری دەیان سالەی رژێم بوو که لەدوای میللەتی کورد رژێم شیعەکانی به دوژمنی سەرسەختی خۆی دەزانی, لەکاتێکدا ئەوان بەشی زۆرینەی پێکهاتەی عێراق بوون, لەلایەکی ترەوە سەرۆکی ولایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا جۆرج بۆش له ١٩٩١/٢/١٥ لەرادیوی دەنگی ئەمریکا هانی خەلکی عێراقی دا بۆ راپەرین له دژی رژێمی بەعس که ئەمەش هۆکارێکی تر بوو بۆ سەرهەلْدان و راپەرین له باشوری عێراق, هەر بۆیە له ٢/ ١٩٩١/٣ گر و بلێسەی راپەرین له شاری بەسرە سەری هەلْدا و زۆر به خێرایی شارەکه پاك کرایەوە له دار و دەستەی رژێم و ئازاد کرا .



راپەرین له باشوری عێراق ١٩٩١



جۆرج بۆش باوك سەرۆكی وولایەتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا ۱۹۹۱

پاشانیش بەچەند قۆناغێكی تر لـەماوەی تـەنها ١٤ رۆژدا لـە كـۆی ۱۸ پارێزگـا نزیكەی ١٤ پارێزگای عێراقی راپەڕی و ئازاد كرا, بەلاّم ئەم سەركەوتنەی خـەلكی عێراق بەتایبەتی شیعەكان حكومەتی ئەمریكای دلّخـۆش نـەكرد بـەلكو دوو دلّـی خستە نێو سیاسەتی ئەمریكا سەبارەت بە دژایەتی و تەمیّ كردنی رژێمـی عێـراق. لەبەرامبەر ئەمەش دا سەدام بە هەموو مەرجەكانی هاوپەیمانان قایل بوو, بۆیە ئەم بارودۆخە وای لە سیاسەتی ئەمریكا كرد كە بە هێواشی پاشگەز ببێتەوە لە پالّپشتی كردنی خەلكی عێراق بۆ روخاندنی رژێمەكەی .

ئینجا لە ١٩٩١/٣/٢٦ جۆرج بۆش رێگای بە حكومەتی عێراقی دا ئـەو تانـك و زرێپۆشانەی كە لـە مەیـدانی جـەنگ بـەجێی هێـشتبوون بكـشێنێتەوە, ئەمـەش دەرفەتێكی گونجاو بوو بۆ رژێم تا سەركوتی خەلكی راپەڕیوی عێراقی پیّ بكات,

چونکه سوپا به هۆی بێ زرێپۆش و تانك و کەرستە سەربازیەکانی دووچاری بێ توانای ڕادەبەدەر ببوو.

بۆیە ئەم پاشماوەی چەکانە هەرچۆنێك بووبێت یارمەتی دەربوو بۆ ڕژێمی عێراق بۆ داگیر کردنەوەی ناوچە ئازاد کراوەکان.لە ١٩٩١/٣/٢٨ کۆبونەوەیەك لەنێوان نوێنەرانی عێراق و ئەمریکا لە صفوان ئەنجام درا, نوێنەری هاوپەیمانان بریتی بوو لە ژەنەراڵ شوارسکۆف و ژەنەراڵ خالد بن سوڵتان و نوێنەری عێراقیش بریتی بوون لە سوڵتان هاشم و فریق صلاح عبود فەرماندەی ( فەیلەقی سێ ). لەم کۆبونەوەیە نوێنەری هاوپەیمانان چەند مەرجێکیان هەبوو دەبوایە نوینەرانی عیراقیش مل کەچ بونایە, مەرجەکانیش بریتی بوون لە دەخاڵ کە ژەنەراڵ شوارسکۆف زۆر بەتوندی و بە سوکایەتیەوە بەرووی نوێنەرەکانی عێراقی خوێندەوە, ئەوانیش بێ هیچ مەرجێك هەموو خاڵەکانیان قبوڵ کرد و مل کەچی تەواویان نیشاندا, تەنها یەك داواکاری سولتان هاشم نەبێت کە بەداخەوە ئەم داواکاریەش لە دژی خەڵکی ڕاپەڕیووی عێراق بوو, ئەویش ڕێگا دان بوو بە هەڵساندنەوەی فڕۆکەی




کۆبونەوەکەی سەفوان ١٩٩١

هەلیکۆپتەرەکان لە ناوەوەی خاکی عێراق . شکوارسکۆف ئەو خواستەی ئەوانی پەسند کرد و تەنانەت ڕێگەی دا کە هەلیکۆپتەرەکان چەکداریش بن. ئەم ڕازی بونەی نوێنەری هاوپەیمانان تەواو بە زیانی خەڵکی عێراق بوو, چونکە ئەگەر ڕژێم نەیتوانیبایە فرۆکە بەکاربێنیت بۆ سەرکوت کردنی جەماوەر هەرگیز بەو شێوەیە خەڵکەکە نەدەبونە قوربانی . تەنانەت خودی سەرۆکی ولایەتی یەکگرتوەکانی ئەمریکا ( جۆرج بۆش) پاساوی بۆ پاشگەزبونەوەکەی دەهێنا و دەیووت: ( لەبەر هەموو هۆیەکی پراکتیکی ئێمە هیچ کاتێک بەڵێنمان نەداوە پشتگیری ڕاپەرین بکەین )(٦).

لەکۆتایەکەیدا ئەمریکیەکان بێناگایی خۆیان ڕاگەیاند لە شۆرش و ڕاپەرینی خەڵکی عێراق و چاوەکانیان داخست لە ئاست ئەو کارەساتە مرۆیانەی بەسەر گەلانی عێراق دەهات , بەتایبەتی ئەمریکا کاتێك زانی شیعەکان کۆنترۆڵی عێراق دەکەن مەترسی لێ نیشت کەحکومەتیکی شیعە مەزهەبی وەك ئێران دووبارە بێتەوە, بۆیە سەدامێکی لاوازی مل کەچی پێ باشتربوو. ڕژێم لە کاتی هێرشەکانی بۆ سەر خوارووی عێراق لەو شوێنانەی ڕاپەرینی لێ ئەنجام درا زیاتر لە دووسەد هەزار هاوولاتی شیعەی کوشت, هەروەها زۆربەی ڕابەرەکانی شیعەی بێ سەرو شوێن کرد. سەدام و دارو دەستەکەی نەهامەتی زۆریان بەسەر گەلی عێراق داهێنا, درندەیی بەعس لە کوردستان گەیشتە لوتکە" ئەنفال و کیماباران و تێکدانی گوندەکان و ڕاگواستنی زۆرە ملێ و لەسێدارەدانی تیکوشەرانی ئازادی کوردستان و چەندان تاوانی تری ڕەشە کوژی .

# ڕاپەڕین وکۆچ ڕەوی کوردستان

ئەگەر چی داگیرکردنی کوێت لەلایەن عێراقەوە بووە مایەی مالوێرانی سەرتاپا گیری بە لەناوچوونی سەدان هەزار مرۆڤ و دارمانی ئابوری و تێك چوونی باری سیاسی ولات, بەلام لەگەل ئەمەش دا گەورەترین هەلی زێرینی هێنایە ئاراوە بۆ گەلی کوردکە بتوانێ مافە ڕەواکانی خۆی بەدەست بێنێ ، چونکە ئەو کۆدووژمنی و ڕووبەرووبونەوە جیهانیەی بەرامبەر بە ڕژێمی عێراق نەك هەر کێشەی سیاسی کوردی زەق کردەوە بەلکو وێنەی گەلی کورد و مەسەلەی نەتەوایەتی لە فۆرمێکی یەکجار مەزندا بەرجەستە کرد و وەك ئەستێرەیەکی ئەلماساوی بە ئاسمانی مێژووی کوردەوە هەلواسی. ئەمە نەك تەنها لەبەر ئەوەی ڕاپەرینی سەرتاپاگیری هێنایە ئاراوە لە کوردستان " بەلکو سەرەتای گواستنەوەی کێشەی لە مێژینەی کورد بوو لە مەسەلەیەکی



ڕاپەرینی کوردستان ١٩٩١

سۆزگەری مرۆڤیەوە بۆ کێشەیەکی سیاسی گرنگی ناوچەیی و دەولی. هەر بۆیە بزوتنەوەی سیاسی کورد توانی تاڕادەیەکی باش هەلی لاوازی باری ئاسایشی رژێم و شپرزە بوون و لێك پچڕاندنی دەسەلاتی دەزگا ئەمنیە سەرکوت کەرەکانی عێراق بقۆزێتەوە بۆ دروست کردنی ڕاپەڕینێکی جەماوەری سەرتاسەری .
سەرکردایەتی کورد هەر لە سەرەتاوە لە سەر ئاستی بەرەی کوردستانی لە ناوچە سنوریەکان هەولـەکانی خۆیان بەشێوەیەکی توکمە چڕ کردەوە, هاوکات بەپەیوەستیەکی بەهێز بە جەماوەری کوردستان توانرا سەرەتای بەرنامەیەك بۆ ڕامالینی دام ودەزگا حکومیەکان دابڕێژرێت. بۆ ئەم مەبەستەش هەولـەکان کەوتنە بواری پراکتیکەوە و تیایدا چەندین دەستەی پێشمەرگە ڕەوانەی سەرجەم شار و شاروچکەکانی کوردستان کرا بۆ دارشتنی بەرنامەو پلانی ڕاپەرین.



هێزی پێشمەرگەی کوردستان ١٩٩١

لەلایەکی ترەوە دەزگا ڕاگەیاندنەکانی بەرەی کوردستانی بەتایبەتیش ڕادیۆی دەنگی گەلی کوردستان و دەنگی کوردستان گرۆتینێکی بەهێزیان بەخشی بە جەماوەر, لەهەمان کات دا زۆربەی خەڵکی ئازادیخوازی کوردستان و بەشێك لە پیاوانی رژێم لە ناوەوەی کوردستان نامەی بزوتنەوەی سەرکردایەتی کوردیان پێگەیشت بۆ ئەنجام دانی ڕاپەرینێکی سەرتاسەری, لە ئەنجام دا لە سەرەتای مانگی ئازار ( ***مانگی تراژیدیا و سەرکەوتنی کورد لە مێژوودا*** ) نرکەی ڕاپەرین بەهاوارو هەڵمەتە جەربەزیەکانی جەماوەر, لەتەواوی چین و توێژەکانی کۆمەڵگاوە ڕاپەرین ئەنجام درا و لەماوەی چەند ڕۆژێك دا تەواوی تەخت و تاراجی بەعسی ڕامالْدرا لە کوردستان. لەلایەکی ترەوە سەرکردایەتی سیاسی کورد لەبواری دیبلۆماسی و پەیوەندی سیاسی دەولی و ناوچەیی لەمەر ڕاپەرین و پاراستنی دەسکەوتەکان کەوتە پەیوەندی کردن و هەوڵی کارا لەگەڵ تەواوی لایەنە دەسەلاتدارە گرنگەکانی مەیدانی سیاسی جیهانی, هەر لەم دیدگایەوە ڕۆژی ٩ - ١٠ / ئازار ١٩٩١ یاریدەدەری وەزیری دەرەوەی تورکیا(**تونگای ئوزگیری**) پیشوازی لە وەفدێکی کوردی کرد بۆ گفتو گۆ کردن لە بارەی پێشهاتەکانی کە لە عێراق ڕوو ئەدەن. لایەنی کوردی ئەوەیان ورووژاند کەلێرە بەدواوە هەماهەنگی لەگەل تورکیا دەکەن و پێویستیان بەهاوکاری حکومەتی تورکی هەیە. داوای ئەوەشیان کرد کە تورکیا داوا لە ولایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا بکات کە گرنگی زیاتر بە کورد بدات(٧). لەو کاتەوە جموجۆلی دیبلۆماسی کورد سات لە دوای سات هەنگاوەکانی چالاك تر خۆی ئەنواند بەتایبەتیش ئەم جارەیان لە دەرگای تورکیا بەرەو جیهانەوە. هەروها لە ١١- ١٩٩١/٣/١٣ بەهۆی کاریگەری قەیرانەکانی کەنداودا لە شاری بەیروتی پایتەختی لبنان کۆنگرەی ئۆپۆزیسیۆنی عێراقی بەسترا, لەوێدا کورد ئامادە بونیکی کاراویەکگرتوانەی هەبوو(٨). سەرەڕای هەوڵی زۆری ئۆپۆزیسیۆنی عێراقی لەناوچەکانی باشور بۆ پاراستن و سەرکەوتنی ڕاپەرینەکانیان, بەلاّم بزوتنەوەی

جەماوەری شارە شیعە نشینەکانی عیڕاق بە بەراوورد بە شارەکانی کوردستان لەئاستێکی زۆر لاواز و پەرتەوازە و دوور لە یەك دەنگی پێوە دیاربوو. ئەگەر ئازادی و ڕزگارکردنی شارەکانی کوردستان بە گەورەترین سەرکەوتنی میللەت و بەهاری خۆشی و ئازادکردن بۆ گەلی کورد دابنرێت, دەبێ شکست و نەهامەتیەکانی دوای ئەم سەرکەوتنەش بەکارەسات و ناخۆشیەکانی میللەت لە مێژوودا تۆمار بکرێت. لەدوای شکستەکانی هێزی پێشمەرگە وجەماوەری کوردستان لە بەردەم هێرش و زەبر و زەنگی دڕندانەی ڕژێمی بەعسی لە شارو شاروچکەکانی کوردستان هەر لە کەرکوکەوە تا بەرزاییەکانی پیرمام چرکە لەدوای چرکە هەمووی نەهامەتی و چارەڕەشی بوون بۆ کورد, سوپای بەعسیش هەنگاو لەدوای هەنگاو لە داگیرکاری و لەناوبردنی خەلکی کوردستان سلی نەدەکرد و نەدەوەستا لە شالاوە سەربازیەکانی تاگەیشتە دەربەندی کۆڕێ .



کۆچ رەوی کوردان ١٩٩١

بەهۆی دڕندایەتی ئەم ڕژێمە بارێکی شێواوی مەترسیدار سەرتاپای کوردستانی گرتبۆوە کە بە ملیونەها مرۆڤی کورد لەشار و شارۆچکەکان بەرەو سنورەکانی ئێران و تورکیا دووچاری ئاوارەیی و دەربەدەری ببوونەوە. ئەم سوپا دڕندەیە هەرشوێنێکی داگیر بکردبایە خەلکەکەی هەموو دەکوشت و زیندە بەچاڵی دەکرد, بۆ نموونە چەندەها خەلکی هەژار و پیر و گەنجیان لە شاری هەولێر لە ناو ماڵەکانی خۆیان دەرهێنا و بەکۆمەڵ لەسەر ڕێگا سەرەکیەکان گوللە بارانیان کردن, بۆیە بەگشتی جەماوەری کوردستان هەڵبژاردنی کۆچی بەکۆمەڵی ڕێگای هات و نەهاتی زۆر پێ باشتر بوو لە جارێکی تر ژیان بەسەر بردن لە ژێر بندەستی و مەرگەسات و بێ ویژدانی ئەم ڕژێمە, ئەو ڕۆژگارانە پڕ بوون لە نەهامەتی بۆ ئەم گەلە, هاوکات ئەگەر کۆچ ڕەو نەبوایە کەسیش بەهانای کورد نەدەهات هەرگیز جیهان ویژدانی بۆ کارەسات و قڕکردنی کوردان نەدەجولا, بۆیە کۆچ ڕەو بەگەورەترین تراژیدیای بێ وێنەی ئەم میللەتە دەژمێردرێت, سەرەرای هەموو ناخۆشیەکانی هیوا و ئومێدێکی تازەی بەخشیەوە بە میللەت , لەبەر ئەوەی کۆچ ڕەو کێشەی کوردی گەیاندە گوێچکەی گەلان و ویژدانی جیهانی لە ناخەوە هەژاند , هەروەها بناغەی درووست بونی پردێکی لە نێوان کوردستان و جیهان دامەزراند. کۆچ ڕەو وەلام دانەوەیەکی پڕ لە شەرمەزاری بوو بۆ دوژمن وسەرەتایەك بوو بۆ بەهاناهاتنی کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی, بەر لەکۆچ ڕەو جیهان لە کەشێکی بێ دەنگی و بێ هەڵوێست لە ئاست تاوانەکانی ڕژێم لەنگەری دەگرت, هەمان کات لەگەل ئەم بێ هەڵوێستیەی جیهان خەڵکانێکی خاوەن هەڵوێست و مرۆڤ دۆست هەبوون هەوڵیان دا تا کۆمەڵگای جیهانی پەلکێش بکەن بۆ ناخی ئەو مەرگەساتانەی بەسەر کورددەهات " لەمانەش **تۆرکوت ئوزال و بەرنارد کۆشنەر و دانیال میتران** و چەند سیاسەت مەدارێکی ئەمریکی و جیهانی, ئەمانە و ڕای گشتی جیهانی توانیان گوشار بخەنە سەر سەرۆکی وولاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا بە وەرگرتنی هەلوێست لە بەرژەوەندی گەلی کورد,

هەر بۆیە جۆرج بۆش وەزیری دەرەوەی وولاتەکەی (جیمس بیکەر) ی رەوانەی ئۆردوگاکانی پەنابەری کورد کرد تا لە نزیکەوە ئاگاداری رەوشی کوردە ئاوارەکان بێت , دوای گەڕانەوەی وەزیری ناوبراو ووتی : (ئەوەی من بەچاوی خۆم بینیم زۆر زیاترە لەوەی باوەڕی پێبکرێت)(٩).



جیمس بیکر وەزیری دەرەوەی ئەمریکا ١٩٩١

## هێرشی سوپای ڕژێم بۆ داگیر کردنەوەی ناوچە ئازاد کراوەکان

لە دوای وەرگرتنی کارتی سەوز لەلایەن ئـەمریکا و بـێ دەنگـی کۆمەڵگـەی جیهانی, ڕژێمی عێراق بە پاشماوەی سوپاکەی و بەشێك لە بەکرێگیراوانی مجاهیدینی خەلقی ئێرانی کەوتە هێرشکردن بۆ داگیرکردنەوەی شارەکانی کوردستان و لەناوبردنی دەسەلاتی خەڵك , بۆ ئەم مەبەستەش سەدام حسێن هێزێکی گـەورە بەسەرپەرشـتی عیزەت دووری و عەلی حسن مجید دەنێرێتە کەرکوك بۆ داڕشتنی پلانـی گرتنـەوەی شـارەکە و وەدەرنـانی هێـزی پێـشمەرگەی کوردسـتان . ئـەوەبوو ئـەم هێرشـە لـە ١٩٩١/٣/٢٨ دەستی پێکرد و لەماوەی دوو ڕۆژدا بەبێ بەرگریەکی ئـەوتۆی هێـزی پێشمەرگە و جەماوەری کوردستان ڕژێم توانی تەواوی شاری کەرکوك داگـیر بکـات. هەڵبەتە هەمیشە بەرەنگاری بچوك و بەرپەرچدانەوەی پێـشمەرگە هـەبوو لـە چـەند شوێنێکی جیا جیـا , بـەلام هـیچ کاریگەریـەکی ئـەوتۆی نـەبوو لەسـەر شـالاوە دڕندانەکەی ڕژێم, لەم هێرشەدا جگە لە سوپا کە پێك هـاتبوو لـە گـاردی کۆمـاری ( حرس جمهوری) هەندێ شەڕکەری ڕێکخراوی مجاهیدینی خەلقی ئیرانیش, هاوکاری سوپای عێراق بوون بۆ داگیر کردنەوەی شاری کەرکوك و پاشانیش تەواوی شارەکانی کوردستان . تەنانەت هەر لەبارەی ئەم شەرەشەوە ( **مریەمی ڕەجەوی** )سەرکردەی بەرچاوی مجاهیدینی خەلق لەکاتی هاندانی چەکدارانی خۆی بۆ هێـرش کرنـە سـەر کوردان دەیووت :

( بەتانکەکانتان کوردەکان بکەنە ژێر و فیشەکەکانتان بۆ پاسدارانی شۆرشی ئێرانی ڕابگرن)(١٠) گرتنەوەی شـاری کـەرکوك لـە لایـەن ڕژێـی عیرآقـەوە کاریگەریـەکی دەروونی خراپی کردە سەر ورەی پێشمەرگە وجەماوەری کوردستان لە بەرامبەریش دا گڕ و تەوژمی باوەڕبەخۆبونی خستە ناو ڕژێم و سوپاکەی.

لە گەرمەی ئەم هێرش و پەلامارە دڕندانەیەی سوپای بەعسی بۆ داگیر کردنەوەی



مسعود ڕەجەوی لەگەڵ سەدام حسێن لەکاتی خەلات کردنی ١٩٩١

شاری کەرکوك حکومەتی عێراق لە هەڵسوکەوتێکی سیاسی و گەمەیەکی سەیردا نێردراوێکی ئاشتیوانی دەنێرێتە لای سەرکردایەتی سیاسی کورد بۆ دانووستان و گفتوگۆکردن لە نێوان کورد و بەغدا. بۆیە نێردراوی ڕژێم بە سەرۆکایەتی موکەرەم تالەبانی لە ڕۆژی ١٩٩١/٣/٢٩ دەگاتە سلێمانی و لە دانیشتنێکی نهێنی دا لە گەڵ **فریدون عبالقادر و نێچیروان بارزانی و محمدی حاجی محمود** دەکەونە گفتوگۆ بەمەبەستی ڕێکەوتن لەسەر وەستانی شەر. بەلاّم لایەنی کوردی بەسەرسورمانیەوە دەپرسن ئەگەر حکومەت بەنیازی ڕێکەوتنە لەگەڵ کورد بۆچی لەو کاتەدا لە گەرمەی هێرش کردنە بۆ سەر کوردستان و بەتایبەتیش گرتنەوەی شاری کەرکوك. لەبەرامبەردا نێردراوی حکومەت دانوستانەکە ئەبەستێتەوە تەنها بەراگرتنی شەڕ لە دوای بەدەست هێنانی کەرکوك لە لایەن حکومەتەوە .

ئەگەر بەووردی سەرنج بدەینە مەبەستی نێردراوی حکومەت بۆ دانووستاندن لەگەڵ کوردا لەو کات وساتەدا بۆمان دەردەکەوێت کە ڕژێمی عێراق تەنها مەبەستی کات کوشتن و فڕوفێلی سیاسی بووە سەبارەت بە چارەسەرکردنی کێشەی کورد. هێرش و پەلامارەکانی سوپای عێراق بەردەوام بوو لە داگیرکردنەوەی کوردستان, سەرکردایەتی سیاسی کوردیش لەبەر خێرایی ڕووداو و پێشهاتەکان نەیتوانی بەرنامەیەکی بەرچاو و ڕوونی هەبێ, بۆ نموونە دەبوایە لێك دانەوەیەکی ڕاستەقینە بۆ توانا سەربازیەکانی سوپای ڕژێم بکردایە, بەڵام بەپێی بیرو بۆچوونی سەرکردایەتی کورد لەو ڕۆژگارەدا سوپای عیراق جارێکی تر ئەو هێزو و توانایەی نابێتەوە کەهێرش بکاتەوە و کوردستان داگیر بکاتەوە. لەڕاستیش دا ئەستەم بوو ڕژێمێکی دۆڕاو لە بواری ڕامیاری ڕوخاو و شەکەت لە باری سەربازیەوە وا بەئاسانی بتوانێت خۆی ڕێکبخاتەوە, لەلایەکی ترەوە سەرکردایەتی کورد بێ ئاگابوو لەو تاکتیکە سەربازیەی ڕژێم کە لەشەڕی کوێت دا توانی هێزی گاردی کۆماری بەهیچ شێوەیەك بەکار نەهێنێ و بیان پارێزێت لە شەڕ و لەناو چوون, بێگومان ئەم هێزەش گاردی سەدام خودی خۆی بوو کە توانایەکی سەربازی لە ڕادەبەدەریان هەبوو بۆ هێرش و سەرکوت کردنی خەڵکی کوردستان. لە زۆربەی ناوچەکانی کە ڕژێم هێرشی بۆ کردەوە, پێشمەرگە و جەماوەر توانیان تاڕادەیەکی باش بەرگری تێدا ئەنجام بدەن , بەتایبەتیش لە دەوروبەری کرکوك و پردێ وپاشانیش ناوچەکانی تری سنوری پارێزگای هەولێر, بەڵام ڕژێم توانی بەردەوام بێت لە پێشرەویەکانی تا لە ڕۆژی ١٩٩١/٣/٣٠ گەیشتە مەخمور و پاشان ئەو زنجیرە گردەڵانەی داگیر کرد کە بە زوورگەزراو ناسراوە, ئینجا لە ڕێگای کەرکوکەوە تا قوشتەپە هات .

لە ١٩٩١/٣/٣١ سوپای ڕژیم لە سێ لاوە بە پالپشتی فڕۆکەو زرێپۆش و تۆپە قورسەکانی هێرشی درندانەی کردە سەر شاری هەولێر بەشێوەیەکی زۆر کوێرانە کەوتە کوشتنی خەڵکەکەی هەر بۆیە لەناکامدا توانی تەواوی شاری هەولێر داگیر

بکاتەوە و بەدرێژایی پێنج کم نزیك گوندی شاوێس بە ئاراستەی شەقلاوە سوپاکەی دابمەزرێنێت, پاشان ڕژێم بۆ ڕێکخستنەوەی سوپاکەی لە پشوێکی کورت دا شالآو و هێرش کردنی بۆ چەند ڕۆژێك ڕاگرت, کەئەمەش سودێکی زۆری هەبوو بۆ پاراستنی سەروگیانی هاووڵاتیان لەڕاکردن و دوور کەوتنەوەیان لە دەستی ڕژێم , چونکە جەماوەری کوردستان دووچاری ڕاوە دونان و شەکەتیەکی زۆر ببوون کە لەڕێگە و بان ودەشتاییەکان بەژن ومنداڵ و پیرو پەککەوتەوە بە پێ خەریکی ڕاکردن و خۆدەرباز کردن بوون لەدەست شالآوی سوپای رژێم. هێزی پێشمەرگەش کەلەماوەی ئەو دوو ڕۆژی رابوردوودا دووچاری شکستی وپەرتەوازەیی و پاشەکشەببوو, بەرگەی هێرشە درندانەکەی ئەم سوپایەی نەدەگرت, بۆیە لە پیرمام بەسەرپەرشتی بەرێز کوسرەت رەسول کۆبونەوەیەکی لایەنەکانی کوردستانی ئەنجام درا تابتوانن پلانێك بۆ بەرەنگار بونەوەی ئەم شالآوەی رژێم دابرێژن ,



کوسرەت رەسول سەر پەرشتیاری کۆبونەوەکەی پیرمام ١٩٩١

لە کۆبونەوەکەدا سێ بەرەی بەرەنگاربونەوەی دوژمن دروستکرا, بۆ ئەوەی لەکاتی شالآوی رژێم بتوانرێت بەشێوەیەکی باشتر پێش لە پێشرەویەکانی سوپای رژێم

بگیرێت ئەوەبوو بە فەرماندەیی جمال مورتکەیی و سەفین مەلاقەرە و شاخەوان و دکتۆر سعید بەرەکانی جەنگ دابەشکرا ئەو فەرماندانە کەوتنە رێکخستنەوەی پێشمەرگەکان و تارادەیەك توانیان هێزەکانیان کۆبکەنەوەو لەسەنگەرەکان و ئامادەباشی بکەن, بەلاّم بەر لەهێرش کردنەوەی رژێم هەندێ ئالوگۆر بە فەرماندەکانی پێشمەرگە کرا, کە نەدەبوایە لەکات و ساتێکی ئاوا مەترسی دار ئەم گۆرانکاریانە بکرێت بەتایبەتی گۆرینی شوێنی جمال مورتکەیی وشاخەوان و ناردنیان بۆ دۆلّی هیران و کەپکی گەرۆتە, چونکە مەترسی هێرشەکانی رژێم ئەوەندە بەهێز نەبوو لە دۆلّی هیران وەك ئەوەی لە رێگای هەولێر و پیرمام چاوەروان دەکرا, بۆیە دوور خستنەوەی ئەوهێزانە لە هێلی پێشەوەی بەرگری مەترسیەکانی شکستی هێزی پێشمەرگەی زیاتر کرد لەبەرامبەر شالاّوی سوپای رژێم . لەماوەی ئەم چەند رۆژەدا سوپا هیچ جموجۆلّێکی سەربازی ئەنجام نەدا هێزی پێشمەرگەش نەی توانی هیچ دەسکەوتێك بەدەست بێنێ هەرچەندە (لە ئێوارەی ١٩٩١/٤/٢ هێزیکی پێشمەرگە بە فەرماندەی جەمال مورتکە بۆ هێرش کردنە سەر سوپای رژێم لە شاوێس و سەرشەقامی سەرەکی هەولێکیان دا شەرێکیش ئەنجام درا بەلاّم بێ ناکام بوو) (١١) .تاکو رۆژی ١٩٩١/٤/٧ سوپا دیسان بە هێزیکی زۆرەوە هێرشی دەست پێکردەوە بەرەو شارۆچکەی پیرمام تاکو نیوەرۆ هەموو بەرزاییەکانی ئەوێشی داگیر کرد, بەلاّم هێزی پێشمەرگەی کوردستان لە چەند شوینێك توانیان بەرەنگاری سوپای رژیم ببنەوە, هەر سەبارەت بەم بەرەنگاربونەوەیە بەرێز نامق سوارە پێشمەرگە و فەرماندەیەکی پارتی و بەشدار بووی شەرەکان دەلێت :

( بۆ رێگەگرتن لە هێرشەکانی سوپای دوژمن لە گوندی بانەمانی خوارووی پیرمام هێزێکی ئێمە بە فەرماندەی خدر سوارە رووبەرووی هێزەکانی سوپای دوژمن بووە بەلاّم بەهۆی زۆری سەربازەکان و بۆردومانی فرۆکەکان ئەو هێزەی ئیمە لەگەل هەندێ پیشمەرگەی یەکیتی بەئەستەم توانیان دەرباز بن و گەرانەوە بۆ دواوە)(١٢).

هەروەها لەدەوروبەری  گوندی گراوی خوار سەری رەش هێزێکی پێشمەرگەی ناوچەی دۆڵی ئاکۆیان بە سەرپەرشتی عـەولا بـۆر کەفەرماندەیـەکی  هێـزی پێـشمەرگەی سەربەرزاییەکانی سەری رەش بە سێ دەستەی جیاواز خۆیان لە بۆسە دائەنێنەوە,



*خدر سوارە فەرماندەو پێشمەرگەی پارتی لە کۆرێ*

کە هەر لەسەری رەشەوە تـا دەگەیـشتە گونـدی گراوکـە دەروانیتـە سـەر شـەقامی سەرەکی نێوان بەستۆرە هەنارە ئەم هێزە دابەش ببوون,  بـەڵام لـە کـاتی شـالاوەکە رژێم لەو رێگایەوە هێرشی  نەکرد بۆ پیرمام کە ئەو هێزە خۆیان بـۆ مـەڵاس دابـوو بەڵکو لەسەر شەقامی سەرەکیەوە خۆی کرد بە پیرمام دا و داگیری کرد. ئەمەش وای کرد ئەم هێزەی یەکیتی بێ ئاگا بێ  لە گـرتنی ( پیرمـام و سـەری رەش ) لەلایـەن رژێمەوە, هەر بۆیە هێزەکە دووچاری نارەحەتی زۆر دەبن تاکو خۆیان دەرباز دەکـەن, ( ئەو هێزەی ئێمە کە بریتی بـووین لـە کۆمـەڵێك پێـشمەرگەی  دۆڵـی ئاکۆیـان و

رەواندوز لەوانە شەهید انور و محمەد سلێمان و محمەد عبدللە و فەیسەل سالح و مزەفەر سالح و چەند پێشمەرگەیەکی تر, دەبوایە دەستەی یەکەمی بۆسەکە ئێمەی ئاگادار بکردبایە وە چونکە ئەوان زووتر ئاگاداری هێرش و پەلاماری رژێم بوون لەکاتی سەرکەوتنیان بۆ پیرمام و سەری رەش, ئەوان شوێنی خۆیان چۆڵ کردبوو , ئەمەش بارێکی مەترسیداری بۆ ئێمە دروست کرد, بۆیە هەردوو دەستەکەی ئێمە بەسەرپەرشتی کاك عبدلله بۆر خۆی و کاك عوزێر فەقیانەیی کاتێك زانیمان سەرومان لێ گیراوەو تەواوی پیرمام و سەری رەش لە ژێر دەستی رژێم دایە , بەناچاری لە رێگایەکی ترەوە بەدەردە سەریەکی زۆرەوە خۆمان دەرباز کرد و گەیشتینەوە حوجران)(١٣).



عەولا بۆر فەرماندەو پێشمەرگەی یەکێتی لە کۆری ١٩٩١

هێرش و پەلامارە سەربازەکانی ڕژێمیش تادەهات بەزەبر تر دەبوو, لەگەڵ ئەوەش دا پێشمەرگە و جەماوەر لە بـارودۆخێکی پەرتـەوازەیی و شـپرزەیی دابـوون, تانـك و زرێپۆش و هێلیکۆپتەرە جەنگیەکانی ڕژێم تەنگیان بە خەڵك و پێشمەرگە چـنیبوو. هێزی پێشمەرگەی کوردستان چەند بەرگریەکی قارەمانانەی ئەنجام دا بـەڵام نـەتوانرا پیرمام بپارێزرێت لە هێرشی دوژمن, لەم ڕووبەڕوو بونـەوەش چـەند پێـشمەرگەیەك بوونە قوربانی .

داگیرکردنی پیرمام لە لایەن ڕژێمەوە کاریگەریەکی زۆر خراپی هەبوو بۆ سەر هێزی پێشمەرگە چونکە هەڵکەوتـەی سـتراتیژی سـەربازی ئـەو شـوێنە گرنگیـەکی تایبەتی و بێ وێنەی هەبوو بۆ سەر تەواوی ناوچەکە. بۆیە دەبوایە هێزی پێشمەرگەی کوردستان بەرنامەیەکی پتەوی بەرگری هەبوایە بۆ پارێزگاری کردنی, بـەڵام بـەهۆی نارێکی دابەش بوونی هێزەکان و پەرتـەوازە بوونیـان نـەتوانرا بەرەنگاریـەکی بـاش بکرێت لەبارەی گرتنی پیرمامەوە .



بەکر مستەفا بەرپرسێکی پێشمەرگەی یەکێتی لە کۆرێ ١٩٩١

بەڕێز مامۆستا بەکر مستەفا فەرماندەیەکی پێشووی یەکێتی لە بارەی گرتنی پیرمامەوە دەلێت ( کاك کۆسرەت لە مەسیف بوو سەرپەرشتی ئەو هیزانەی دەکرد کەلەویّ بوون و هی هەمووحزبەکانی تێدابوو, لەناکاو حکومەت خۆی کۆکردەوە و هێرشی هێنا, ئیمە دەمانزانی کە نیازی هەیە بەلاّم تەسەوەرمان وانەبوو بتوانێ سەربکەویّ, ئەو شوێنانەی کە ئێمە هێزمان تێدا دانابوو حکومەت خۆی لەو شوێنانە نەدا )(١٤).

بەگشتی ئەم شالاّوە دڕندانەی ڕژێم بارودۆخێکی یەکجار مەترسیداری دروست کرد, بۆ یەکەم جار لە مێژووی گەلەکەمان مرۆڤی کورد بە تێکڕای کەرت وتوێژەکانەوە بە منداڵ و پیر و ژن و پیاو, گەنج و پێشمەرگە و سەرکردایەتی لایەنە سیاسیەکانیەوە گیانی بکەوێتە مەترسیەوە, بۆیە لەپێناو پاراستنی گەلەکەمان هیچ هەوڵ و تەقەلاّیەك نەما کورد پەنای بۆ بەرێت .

لە /٤/ ١٩٩١ مەسعود بارزانی سەرۆکی بەرەی کوردستانی بانگەوازێکی فریاکەوتنی ئاراستەی ولاّتانی ناوچەکە و فەرەنسا و بەریتانیا و ولایەتەیەکگرتوەکانی ئەمریکا و تورکیا و سعودیە کرد بۆ دۆزینەوەی ڕێگا چارەیەك تا بتوانن پێش لەهێرش و پەلامارەکانی سوپای عێراقی خوێنمژ بگرن. دوابە دوای ئەم بانگەوازە حکومەتی فەرەنسا یاداشتنامەیەکی ئاڕاستەی نەتەوەیەکگرتوەکان کرد بۆ بەفریا کەوتنی خەلکەکە, پاشانیش تورکیا و ئێران هەمان داخوازیان لە نەتەوەیەکگرتوەکان کرد. بەرە بەرە ولاّتان و دۆستان پشتگیریان لە پاراستنی میللەتی کورد دوپات کردەوە تا لەناکامدا بە دەست پێشخەری فەرەنسا لە ١٩٩١/٤/٥ نەتەوە یەکگرتوەکان بە زۆرینەی دەنگ بڕیاری ٦٨٨ یان دەرکرد, ئەگەرچی لەڕووی یاساییەوە ئەم بڕیارە زیاتر بە بڕیارێکی هاوکاری مرۆیی ناسرا بوو نەك سیاسی, بەلاّم بۆ ئەو کات و ساتە دژوارەی کە گەلی کوردی تێدابوو بڕیارێکی چارەنوس ساز بوو. هەروا بۆجاری یەکەم لە دوای پەیماننامەی سیڤەرەوە لەساڵی

١٩٢٠ ناوی کورد بە ڕوون و ئاشکرا لە دیکۆمێنتەکانی نەتەوەیەکگرتوەکان هات ,
دوابەدوای بڕیاری پاراستنی کورد لەلایەن نەتەوەیەکگرتوەکان ناوچەیەکی ئارام
دروست کرا لە ١٩٩١/٤/١٧ هێزەکانی سەر بە ولآتەیەکگرتوەکانی ئەمریکا و
بەریتانیاو فەرەنساو هۆڵەندا و ئیتالیا و ئیسپانیا هاتنە نێو باکوری عێراق,
لەمیانەی کردەوەیەکدا کەناوی نرا (پرۆڤاید کۆمفۆرت ), ئەم هێزانە سەرەتا
بەقوولآیی ٣٠ میل رووە و شارەکانی زاخۆ و ئامێدی و سەرسنگ پاشان زیاتر
بڵاوەیان لەخاکی کوردستاندا کرد, لە کۆتاییدا توانیان ناوچەیەکی ئارام بە درێژایی
١١٥کم لەسەر سنوری عێراق- تورکیا بە قولآیی ٥٠کم دابمەزرینن.(١٥) جگە لە
هەوڵەکانی سەرکردایەتی کورد میدیاکانی جیهانیش ڕۆلێکی کاریگەر و سود
بەخشیان هەبوو, لە کاتی ڕاپەرین و کۆڕەودا ژمارەیەك لە ڕۆژنامەنووسان و
ڕاگەیاندنی جیهانی هاتنە کوردستان, ئەم ڕۆژنامە نووسانە بەشێکیان گیانیان بەخت
کرد لە پێناوی کارەکانیانەوە وەك (**ڕۆزانا فەرجینا**) و دوو لە هاوڕێکانی کە بۆ
دەزگای بی بی سی بەریتانی کاریان دەکرد, ئەم ڕۆژنامە نووسانە بەرێگای سنوری
تورکیاوە دەهاتن بۆ ڕووماڵ کردنی ڕوداوەکان و ناساندنی دەنگی راستەقینەی کورد
بە جیهان , بەلآم لە کردەوەیەکی تەم و مژاوی دا کوژران و بێ سەرو شوێن کران .
هەر لە هەمان کات دا وێنەگری ئەڵمانی ( **گاد گرۆس** )لە کەرکوك لەکاتی وێنەگرتنی
هێرشی زرێپۆشەکانی سوپای عێراق بۆ سەر خەڵکی کوردستان لەلایەن سەربازەکانی
عێراقەوە کوژرا, هەروەها تیمێکی هەواڵنێری فەرەنسی لە کاتی شەڕی کۆڕێ
گەیشتنە ئەوێ و هەواڵ و ڕووداوی ناوچەکەیان بۆ دەزگاکانی راگەیاندنی جیهانی
دەنارد . بۆیە ڕۆڵی کاریگەرو بەرچاوی دەزگاکانی ڕاگەیاندنی جیهانی نەبوایە
لەوانەبوو بریاری ٦٨٨ دەرنەچووبایە, لەم بارەیەوە ژەنەراڵ بیکیلی فەرماندەی هێزی
هاوپەیمانان بە جوانی باسی شوێن پەنجە و نەخشی دەزگاکانی ڕاگەیاندن دەکات,
لەکاتی سەردانی بۆ ئۆردوگای ئاوارەکانی کوردی عێراقی لە تورکیا و دەڵێت :

(شتێك کەئێمەی هێنایە ئێرە کامێرا بوو, لەبەر ئەوە هەوڵ بدەن مەسەلەکەتان جوان بە خەڵکی دنیا بناسێنن)(١٦). ئەو ماوەیە خەڵکی کوردستان لە ماندو بوونێکی زۆر سەخت و پڕ مەترسیدار ژیانی بەرێ دەکرد, کاتێکیش ناوچەی ئارام دانرا ئەوەبوو خەڵکەکە گەڕانەوە بۆسەر زێدی خۆیان. ڕژێم هەر لە دوای شکستەگەورەکەی بەدەستی هێزی پێشمەرگەی کوردستان لە دەربەندی کۆڕێ درکی بەوە کرد ئیتر نەستەمە بە شەڕ و کوشتار بتوانێ کێشەی ڕەوای گەلی کورد چارەسەر بکات, هەر بۆیە لە دوای شکستی لەم شەڕە گفتوگۆی نیوان رژێم و سەرکردایەتی کورد دەستی پێکرد, هەرچەندە بەگوێرەی هەندێ سەرچاوە پێشتریش لەماوەی رۆژانی ڕاپەرین و دوای ڕاپەرینیش چەند جارێك سەرکردایەتی کورد و بەغدا بۆ گفتوگۆکردن و دانوستاندن پەیوەندیان کردبوو " سەدام حسێن نامەیەکی لە رۆژی ١٩٩١/٣/١٣ بۆ جەلال تاڵەبانی سکرتێری گشتی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان ناردبوو, ئەمەش هاوکات بوو لەگەڵ دەست پێ کردنی ڕاپەرین لە شاری هەولێر.(١٧) بەڵام لە کات و ساتی وا هەستیاری پڕ لە هەورازو و نشێوی سیاسی و خێرایی ڕووداوەکان لە عێراقدا هەوڵەکانی گفتوگۆ هەمووی بێ ئاکام بوون. لەوکاتەوەش کە سوپای عیراقی دەستی کرد بە هێرشەکانی بۆ سەر کوردستان, بەرەی کوردستانی ئامادەیی نیشان دا بۆ گفتوگۆ کردن بەڵام حکومەت تا شکستی سوپاکەی لە کۆڕێ وەڵامی کوردی نەدایەوە .

## هۆكارەكانی شكستی كورد لە دوای ڕاپەڕین

هەرچەندە بەرەی كوردستانی بەپلان و بەرنامەیەكی تاڕادەیەك پوخت و تۆكمە توانی سەركردایەتی ڕاپەڕینی خەڵكی كوردستان بكات, بەلاَم نەیتوانی پارێزگاری لە دەسكەوتەكانی بكات و لەماوەی چەند ڕۆژێكی كەمدا ڕژێم دڕندەتر لە جاران توانی كوردستان داگیر بكاتەوە. قۆناغی دوای ڕاپەرین بە یەكێك لە كاتە بێ بەرنامەییەكانی سەركردایەتی بەرەی كوردستانی ئەژمێردرێت, هەڵبەتە بۆ ئەم بارە نالەبارەش كۆمەڵێك هۆكار هەن كە پێویستە بەڕوونی باسی لێ بكرێت ئایا بۆچی نەتوانرا ڕاپەڕین و دەستكەوتەكانی ئازادی بپارێزین, خستنە ڕوو و شەن و كەوكردنی هۆكارەكانی شكستمان ڕەنگە زۆر گرنگ تربێ لەباس كردن و ڕوونكردنەوەی هۆكارەكانی سەركەوتنمان لە ڕاپەڕین, بۆیە بەهەند وەرنەگرتنی هۆكارەكانی شكستمان بە شێوەیەكی زۆر بنەڕەتیانە مانەوەمانە لە نێو گۆمی شكستێكی تر و دوور كەوتنەوەمانە لە ئازادی و ڕزگاری یەكجارەكی, لێرەدا بە پێویستی ئەزانم بەڕاشكاوانە ئامـاژە بە چەند هۆكارێكی گرنگ بكەم كەبونە هۆكاری شكستی دەستكەوتەكانی ڕاپەڕین و بەهاری ئازادی .

٢- ڕێكنەخستنی ئەو هەموو چەكدارانەی كە هاتبونە ڕێزی پارتەكانەوە .

٣- بە هۆی بیری تەسكی حزبایەتی و ڕاكێشانی جەماوەری زۆر بۆ خۆیان حزبەكانی كوردستان ئەوەندە بیریان لە هێڵی بەرگری نێوان ڕژێم و كوردستان نەدەكردەوە .

٤- سود وەرنەگرتن لەوچەكە قورسانەی كە لەدەست هێزی پێشمەرگەی كوردستان بوون,

٥- بەهەند وەرنەگرتنی توانا سەربازیەكانی خەڵكی دلسۆز .

٦- بەرز بونەوەی گیانی تۆڵە سەندنەوە لەلایەن خەڵكی چەكدارەوە .

٧- نەبوونی حکومەتێك یان سەرکردایەتیەکی یەکگرتووی کوردستانی کە هەموو پارتە کوردستانیەکان مل کەچی بریار و فەرمانەکانی بن .

٨- برسیەتی و نەداری بەتەواوی ڕووی لە خەڵکەکە کردبوو ئەمەش کاریگەری زۆری هەبوو لەسەر پتەوکردن وبەردەوامی گیانی بەرگری نیشتیمانی .

٩- پروپاگەندەی پیاوانی ڕژیم لە ناو کوردستان گوایە ڕژیم چەکی کیمیاوی بەکاردێنی .

١٠-ڕاپەرینەکە لە لایەن کۆمەڵگەی جیهانیەوە بایەخێکی ئەوتۆی نەبوو.

١١- نەبوونی ڕاگەیاندنێکی کاریگەر و بەهێز بۆ ئەوەی بیرو باوەر و هەستی جیهانی ڕابکێشیت بۆ ڕاپەرینەکە .

١٢-نەهاتنی هیچ یارمەتیەکی مرۆیی بۆ خەڵکی ڕاپەڕیوی کوردستان, چونکە بەگشتی خەڵك لە باری برسی بوون دا دەژیا .

١٣- ڕاگەیاندنی ووتاری سەرۆکی ئەمریکا بەوەی کە ئەم ڕاپەرینە شتێکی ناوخۆییە .

١٤-ڕەنگدانەوەی شیعە گەری لە ڕاپەرینەکانی خوارو و ناکامی خراپی دروست کرد لەسەر سۆز و هەڵوێستی نێودەولەتی .

١٥- نەبوونی پەیوەندی لە نێوان ڕاپەڕینی کوردستان و ڕاپەڕینی خوارووی عیراق .

١٥ - پسپۆری هێزی سوپای عێراق لە شەڕی شارو ڕووبەڕو و بونەوەی گەورە دا, ئینجا لەبەرامبەریش دا نەشارەزایی و نەبوونی ئەزمون لە تاکتیکی شەڕی بەرفراواندا لە لایەن هێزی پێشمەرگەی کوردستان بەجۆرێك شۆرشی کورد زیاتر بەرجەستەی ئەزمونی شەڕی پارتیزانی بوو نەك جەنگی لەو شێوەیە.

## هێرشی یەکەمی دوژمن بۆ دەربەندی کۆری

هەمیشە شاخ و لووتکە بەرزەکانی کوردستان پەناگە و پاڵپشت بوونە بۆ شۆرشە یەك لەدوا یەکەکانی کورد, بزوتنەوەی رزگاری خوازی کوردستان بەهۆی سود وەرگرتن لە سروشتی هەلکەوتەی جوگرافیاکەی توانیویەتی درێژە بە خەبات و تێکوشانی خۆی بدات گەلێك جار بەهۆی سروشتی هەلکەوتەی چیاکانەوە شەرو پەلامارەکانی دوژمن بە قازانج و سەرکەوتنی پێشمەرگە تەواو بوە, بۆیە بەتێروانین بۆ هەلکەوتەی تۆپۆگرافیای کوردستان ئەوەمان بۆ دەسەلمێنێت کە کورد لەکۆنەوە توانیویەتی مان ونەمانی خۆی لە شاخەکانەوە بپارێزێت .



دەربەندی کۆرێ

لەم سالآنەی دوایش هێزی پێشمەرگەی کوردستان بە ئەزموونی تاقیکردنەوەی چەندین شەرو رووبە روو بونەوە لە گەلّ سوپای دوژمن ئەم راستیەی بۆ روون بۆتەوە کە هەلکەوتەی جوگرافیای کوردستان سود بەخشە بۆ پەناگە وحەشارگە و جم وجۆلی پارتیزانی, بۆیە کاتێك کورد لە دەشتاییەکان بەرگری پێ نەکرا ئەوا لە شاخ و

دۆڵەکان دەتوانێت دوژمن بشکێنیت, لەم پیناوەش دا دەربەندی کۆرێ باشترین نموونەی ئەم ڕاستیەیە. ئەم دەربەندە هەلکەوتەیەکی سروشتی لەبارە بۆ ڕوبە ڕوو بوونەوە لە گەڵ سوپای دوژمن, چونکە پێکهاتوە لە زنجیرە چیایەکی درێژ کە لە نێوان گوندی کۆرێ و گوندی حوجران درێژ بۆتەوە, ئەم زنجیرە چیایە شەق بووە و شەقامی سەرەکی نێوان هەولێر و شەقلاوەی پیادا تێپەڕدەبێت. ئەو شەقامە سەرەکیە تا سنورەکانی حاجی ئۆمەران کە بە شەقامی هاملتۆن بەناوبانگە بەرەو سنوری ئێران هەڵدەکشێت, لە دوولاوە شاخی سەرکەش دەڕوانیتە سەر شەقامەکە بۆیە لەرووی سەربازیەوە هەلکەوتەیەکی گونجاوە بۆ بەرگری کردن و بەگژداچونەوەی هێرشەکانی دوژمن, چونکە هەر کاتێك بەرزاییەکانی ئەم بەرو ئەو بەری سەرووی شەقامەکە کۆنترۆڵ بکرێت ئەستەمە هیچ هێزێك بتوانێت بەناوە ڕاستی دا تێبپەڕێت. جوگرافیا وهەلکەوتەی تۆپۆگرافیای سەربازی لەرابوردوودا کاریگەری بەرچاو وگەورەی هەبووە لە سەر شەڕی نێودەولەتیەکان, بۆ نموونە : سەرماو دیمەنی بەفراوی ولاتی روسیا زۆر کایگەربوو لەسەر تێکشکاندنی هێزەکانی ناپلیون و هیتلەر, گەورەیی پانتاییەکانی وولاتی چین کاریگەری بەرچاوی هەبوو بۆ شکستی سوپای یابان, هەربۆیەش هەلکەوتەی جوگرافیای دەربەندی کۆرێ کاریگەری هەبوو لەسەر شکستی سوپای ڕژێم و سەرکەوتنی هێزی پێشمەرگەی کوردستان .

لە ئەنجامی داگیر کردنی پیرمام پێشمەرگەیەکی زۆر بەرەو کۆرێ و حوجران پاشەکشەیان کردبوو, بەلاّم بەهۆی پەرتەوازە بوون و نەبونی بریارێك بۆ بەرەنگاربوونەوە دژی شالاوەکەی ڕژێم نەتوانرا لەوێ دابمەزرین, بۆیە تەنها بەشێك لەو پێشمەرگانە لە دەربەندی کۆرێ مانەوە و سەنگەریان لە دژی سوپای ڕژێم گرت, ئەوانیش بریتی بوون لە هێزێکی پارتی بەسەرپەرشتی دکتۆر سعید و حالی دۆلەمەری وخالید ئاژگەیی و هەلگورد خدر, لەگەڵ ئەمانەشدا, بەرێز حسەن کوێستانی بەخۆی و دوو پێشمەرگە و ئۆتۆمبێلێکی سپی گەیشتە ئەوێ[١٨] .



حەسەن کوێستانی بەرپرسی هێزەکانی یەکێتی لە کۆرێ ١٩٩١

ئەگەرچی ئەم هێزانەی کە مابوونەوە ژمارەیان کەم بوو بەبەراوورد لەگەڵ ژمارەی هێزەکانی دوژمن, بەڵام هەندێ جار کەسانێکی کەم دەتوانن ڕێڕەوی چارەنوسی جەنگێك بەسەرکەوتنی خۆیان یەك لابکەنەوە, ئەو پێشمەرگانە بێ ئەوەی بزانن کۆتاییان بەچی دەگات بڕیاری شەڕی مان و نەمانیان لەدژی سوپا داگیرکەرەکەی بەعس دا. لەبارێکی سەخت و پڕ ناستەمی وادا کە کۆچی میللەتێك بوو بەرەو سنوورەکان ئەو پێشمەرگانە کەس وکاری خۆیان بەجێ هێشتبوو بڕیاری بەرەنگاربوونەوەیان دابوو. لەگەڵ ئەوەش دا هەوڵ و تەقەلاکانی سەرکردایەتی کورد و سەرۆکی بەرەی کوردستانی بەڕێز مەسعود بارزانی کاریگەری هەبوو بۆ بەرەنگار بوونەوەی سوپای دوژمن.

بەتایبەتیش وتارەکەی بارزانی لە ١٩٩١/٤/٣ لە شارۆچکەی سۆران کە پێشکەشی جەماوەری کوردستانی کرد و تێدا ووتی :

( ئایا بۆ کوێ بڕۆین ؟ لە غەیری بەرگریکردن ڕێگای دیکەمان نیە, دڵنیابن دوژمن هیچ نیە بەرگری کردن لەکوردستان ئەرکی سەرشانی هەموومانە, وورەی پێشمەرگەش بەرزە , یان دەبێ دوژمن نەیەتەوە بۆ کوردستان یان دەبێ بەسەر لاشەی ئێمە دا بێتەوە بۆ کوردستان ).(١٩)ئەم وتارەی بەڕێزیان لەم کات وساتە تەنگەدا بەتەواوی ورەی جەماوەرو هێزی پێشمەرگەی بەرزکردەوە, هەرلەوێوە لەلایەن سەرکردایەتی بەرەی کوردستانی داوا لە پارتە کوردستانیەکان کرا هێز ئامادەبکەن بۆ شەڕکردن لەدژی داگیرکەران, سەید کاکە ئەندامی مەکتەبی سیاسی ئەوکاتی حزبی سۆشیالیستی کوردستان دەڵێت:

( بەڕێز مسعود بارزانی داوای لێکردم هێزێك لە حزبی سۆشیالیست ئامادە بکەم بۆ کۆرێ تا پێش لە سوپا بگرین )(٢٠). ئیتر ئەم جەماوەرەی کە بە ڕێگاوە بوون بەرەو سنورەکان بەهۆی بوونی سەرکردایەتی کورد لە ناوچەکە ئومێد و فەرامۆشیان کەوتەوە دڵ, چونکە لە لایەن کەسانی نەفس نزم پڕوپاگەندەی وا لەناو خەڵك بڵاودەکرایەوە کە گوایە سەرکردایەتی کورد پێش ئەوان کوردستانیان جێ هێشتوە . لەلایەکی ترەوە بەڕێز قادر عوسمان ئەندامی سەرکردایەتی حزب اللە شۆرشگێر دەڵێت:

( کاك مەسعود لەڕێگای بەریزان ملازم یونس و ملازم دڵشاد هەواڵی نارد بۆمان تاکو هێزێك رەوانەی کۆرێ بکەین بۆ بەرەنگار بونەوەی دوژمن, بۆیە ئێمەش لەسەر بریاری بەڕێز شێخ ئەدهەم بارزانی هێزێکی باشمان ئامادەکرد بە پرچەکەوە ناردمان بۆ کۆرێ )(٢١).



*قادر عوسمان فەرماندەیەکی پێشمەرگەی حزب اللەی شۆرشگێڕلە کۆرێ*

لەهەمان کات دا هەردوو ئێزگەکانی دەنگی کوردستان و دەنگی گەلی کوردستان دەورێکی بالآیان بینی لە هاندانی خەڵك بۆ شەڕکردن و بەرەنگاربوونەوە دژی سوپای بەعسی .

دوای نیوەرۆی رۆژی ١٩٩١/٤/٧ شەڕی یەکەمی کۆرێ دەستی پێکرد, ئەو هێزەی دوژمن کەویستیان بێنە دەربەندەکە بریتی بوون : لە چوار زرێپۆش لە جۆری (( T55-T72 ))و چەند بارهەڵگرێك و ژمارەیەك سەربازی زۆر,



( بەڕێزان مـــەسعود بارزانی ،ملازم یونس ، ملازم دلشاد، فرنـــز ١٩٩١)

سەرەتا تانك وزرێپۆشەكانی پەیتا پەیتا بەرەو دەربەندی كۆڕێ كەوتنە جوڵە كـردن، تا ئەو كاتەش هێزی پێشمەرگە جگە لە گیان فیداكاری هیچ پلانێكی توكمەی تـری نەبوو بۆ بەرەنگار بونەوە، بەلاّم دیار بوو پێشمەرگە ئەم دەربەنـدەی وەك شـوێنێكی گرنگ بۆ بەرەنگاربوونەوە هەلبژاردبوو، بۆیە كاتێك سوپای ڕژێـم كەوتـە جوڵـە بـۆ گرتنی دەربەندەكە لەو كاتەدا پێشمەرگەكان بەرلە سەربازەكانی دوژمن سەرشاخ و سەنگەرەكانیان قایم كرد، سەرەتا سەربازەكان ویستیان سەركەونە سەر بەرزاییەكانی ڕۆژئاوا بەلاّم لەو كاتەدا پێشمەرگەكان لێیان هاتنە دەست و بەرپەرچیان دانەوە.

بەرێز حەمیدەفەندی فەرماندەی هێزەكانی پارتی لە كۆڕێ دەربارەی شەڕەكە دەلێت :

( كاتێك ڕژێم هێرشی هێنا بۆ سەر پیرمام من و حالی دۆلەمەری لە گوندی سارداو بوین لەلای كاك مەسعود بەیانیەكەی كە هەواڵی هێرشەكەی ڕژێم گەیشت



حەمید ئەفەندی بەرپرسی هێزی پێشمەرگەی پارتی لە داستان کۆڕێ ١٩٩١

لەسەرەتاوە ئەو دەربەندەمان هەڵبژاردبوو بۆ بەرگری, کاك مەسعود من و حالی دۆلەمەری وهەندێ پێشمەرگەی ناردەوە, ئێمە هەر کە گەیشتینە کۆڕێ پێشمەرگەی هەموو حزبەکان لە پاشەکشەدابوون لە پیرمامەوە دەهاتن بۆ کۆری, لەوێ چەند برادەرێکی خۆمان بینی لەوانە دکتۆر سەعید, داوامان لێ کرد دەبێ لێرە بەرگری بکەین, هەر لەوێ بریاری شەڕو بەرەنگار بونەوەی دوژمنمان دا, وە من بەخۆم داوام لە دکتۆر سعید کرد هەندێ پێشمەرگە بنێرێتە سەر چیا, خۆشمان لەناو دەربەندەکە خۆمان لە بۆسەدانایەوە, لەوکاتەدا تانك وزریپۆشەکانی ڕژێم هاتن بەرەو دەربەندی کۆڕێ من بەجیهاز ئاگاداری هەموانم کردەوە کە تەقەنەکەن تاکو نزیك دەبنەوە ئەوەبوو کاك خەمەد کە لەگەل هێزەکەی دکتۆر سەعید لەسەر چیا

بوو بە ئارپیجی و بیکەیسی تەقەیان لە سەرباز و زرێپۆشەکانی رژێم کرد ئێمەش لـە خوارەوە لە نزیك گۆرستانەکەوە هێرشمان کردە سەریان, ئـەوەبوو هێزەکـەی دوژمـن شکان)(٢٢)



سەید کاکە فەرماندەی گشتی هێزی پێشمەرگەی حزبی سۆشیالیست لە کۆرێ ١٩٩١

هەرسەبارەت بەم بەرگریەی شەڕی یەکەمی پێشمەرگە لە کۆرێ بەرێز سەید کاکە لە چاوپێکەوتنێکدا دەلێت :

( لە هەولێر و پیرمـام نـەمان تـوانی بـەرگری پێویـست بکـەین بۆیـە کـشاینەوە دەربەندی کۆرێ, هێزێکی بارزانیەکانم بینی کە دکتۆر سـعید سەرپەرشـتی دەکـردن هێزەکەیان خۆی لە بیست پێشمەرگە تێپەر نەدەکرد بەلام بریاری مانـەوەو بـەرگریان دابوو)(٢٣). لەو ساتە وەختەدا پێـشمەرگەی هەمووحزبـەکان لەپاشەکـشەدابوون لـە پیرمامەوە بەرەوکۆرێ, بیروباوەری پۆلاینی ئەم پۆلە پێشمەرگەیە لەو کات و ساتەدا بیرو باوەرێکی لەرادەبەدەر شۆرشگێرانەبوو, چونکە لەهەل ومەرجێکی وانالەبار و



دکتۆر سەعید  فەرماندەی هێزی بارزان لە داستانی کۆڕێ ١٩٩١

نادیاردا  بەهێزێکی ژمارە کەمی وا, بەرەنگاربونەوەی سوپایەکی زەبـەلاح ودڕنـدەی وەك سوپای بەعس, بڕیارێکی ئەوپەڕی دلێرانە و نەبـەزی و چارەنوسـاز بـوو.بـەڕێز جەوهەر عزیز شێرۆکی پێشمەرگەی بەشداربوو لە شەرەکە دەلێت:

(ڕۆژی ١٩٩١/٤/٧ شەڕەکە لە پیرمام دەستی پێکرد دوژمن لە هەولێرەوە  هـاتبوو بەرەو پیرمام  لە نێو  لۆفەکان و دارستانەکان چـەند بەرگریـەك کـرا بـەلام هێرشـی سوپای رژێم گەیشتە کۆڕێ, کاتژمێر دووی دوای نیوەڕۆ دەبابەکانی سوپا لە کۆڕێـوە جولەیان کرد بەرەو حوجران, لەوێ ئێمە چەند پێشمەرگەیەکی سەر بە هێزی بارزان و مـام حـال دۆلەمـەڕی بـووین, کـەزانیمان دوژمـن بـەرەو ڕوومـان دێـت چـەند

پێشمەرگەیەك سەركەوتینە سەر شاخەكەی دەیڕوانیە سەر دەربەندەكە بەشێكیش لــە خوارەوە ئامادەبوون ئەوەبوو دەبابەكان گەیشتنە دەربەندەكــە, شــەڕ دەســتی پێكــرد پێشمەرگە بەربەرچی هێزەكەی دوژمنیان دەدایەوە ئینجا دەستمان كرد بە هاویشتنی ئاربیجی ئەوەبوو ئاربیجیەكان كاریگەریان دەبوو لە سەر هێرشەكەی دوژمن و توانرا یەك لەو حەوت دەبابانە تێك بشكێنرێ شكانی ئەو دەبابانە بەهۆی ئارپیجیەكانــەوە بوو بەتایبەتی یەكەم دەبابەی كە تێكشكا عوسمان پیران بوو ئارپیجیەكەی هاویشت, ئا لێرەدا شەڕی یەكەمی كــۆرێ دەســتی پێكــرد بەشكــستی ســوپای ڕژێــم كۆتــایی پێهـــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــات)(٢٤)



*جەوهەر عەزیز شێرۆكی پێشمەرگەی بەشدار بوو ١٩٩١*

ناپلیون پۆناپارت لە تێڕوانینەكانی بۆ پرنــسیپی ســەركەوتن لــە جەنگەكانــدا پێــی وابوو( سەركەوتن دەبیتە چانسی ئەو لەشكرەی كە هیزی پترە ) بەڵام هەنــدێ جــار مێــژوو بــە جــۆرێكی تــر خــۆی دەردەخــات جوڵــە و تــاكتیكی شۆڕشــگێڕانەی پارتیزانــەكان دەبێتــە پێــچەوانەی پێــشبینی بنــەما ســەربازیەكان, ئــەوەتا هێــزی

پێشمەرگە لە قۆناغی دەسپێکی شەڕەکەدا بە هێزێکی کەم و ناسەقامگیر توانی شکست بە لەشکرێکی زۆر و بە ئەزموونی شەرکەر بێنێ، هەر بۆیە وەشاندنی گورزی یەکەمی پێشمەرگە لە زرێپۆش و تانکەکان لە کۆرێ توانی چارەنوسی تاکتیکی هێزی دوژمنی بەتەواوی بگۆرێ .



*حالی دۆلەمەری فەرماندەی پێشمەرگە لە کۆرێ ١٩٩١*

هێزی پێشمەرگەی کوردستان لە سەرشەقامی سەرەکی دەربەندی کۆرێ بەرەنگاری زرێپۆشەکانی دوژمن بوونەوە و شەڕێکی قورس ڕوویدا، سەرئەنجام دوژمن بەلووت شکاوی تانك و زرێپۆشەکانی بەجێ هێشت و دووچاری شکستێکی وا بوو کە هەرگیز بیری لێ نەکردبۆوە .



سەفین مەلاقەرە بەرپرسێکی سەربازی یەکێتی ١٩٩١

هەر سەبارەت بەم شەڕە بەڕێز سەفین مەلاقەرە فەرماندەیەکی پێشووی هێزی پێشمەرگەی یەکێتی لە چاوپێکەتنێکدا دەڵێت:
( شەڕی ٨/ی مانگ (مەبەستی ٧/مانگە) ئێمە زۆر بە درەنگەوە گەیشتینە شوێنی شەڕەکە کەبەرەو کۆتایی دەچوو حکومەت شکستی خواردبوو, بینیمان دەبابەکان لەناو دەربەندەکەتەقەیان دەکردو تەقەشیان لێ دەکرا ودەکشانەوە) (٢٤) دیاریدەیەکی سەیر سەبارەت بەم شەڕە ئەوەبوو لە پاش شکاندنی دوژمن, ئەو زریپۆشانەی کە بەتێك شکاوی کەوتنە دەستی هێزی پێشمەرگە لە ناوەوە پڕ بوون لە کەلوپەلی ناومالّ و جوانکاری ئافرەتان , پێشتر سەربازەکان ماڵی کوردیان تالآن کردبوو بۆ ئەوەی بە دیاری بۆ ماڵەکانی خۆیان ببەنەوە بەلاّم تەنانەت خۆشیان جارێکی تر بە زیندوویی نەگەڕانەوە بۆ ماڵەکانیان.



زرێپۆش و تانکەکانی سوپای عێراق لە دەربەندی کۆرێ بەدەستی پێشمەرگەوە ١٩٩١

لەگەڵ شکاندنی دوژمن شەقامی کۆرێ پڕبوو لە لاشەی کوژراوی سەربازەکانی سوپا زۆر بەیان بەهۆی گڕگرتنی تانك و زرێپۆشەکان سەرتاپای جەستەیان سوتابوو بە جۆرێك تەماشاکردنی مەترسیدار بوو, هەروەها جگە لە سەربازەکان تەرمی چەند ئەفسەرێکیشی لێ بوو.پێشمەرگەکان بەسەرکەوتنی ئەم شەڕە ژەنەراڵەکانی سوپای عێراقیان سەرسام کرد کە چەند ئازاوخۆڕاگربوون, بۆیە ئەم سەرکەوتنە بوو بە خاڵی وەرچەرخانێکی تازە و بناغەیەکی پتەو کە ئیتر هێزی پێشمەرگە متمانە بە تواناکانی خۆی بکات بۆ بەرگری کردن و چیتر رێگا نەدات بە دوژمن پێشڕەوی بکات لەم دەربەندە بۆ داگیر کردنی هیچ شوێنێکی تری کوردستان . ئەم شەڕە شکستێکی گەورە بوو بۆ دوژمن چونکە ڕژێم بەدرێژایی ئەو چەند ڕۆژەی لە هێرش و شالاوەکانی هەرگیز شکانی وای بەخۆیەوە نەبینی بوو, شەڕی یەکەمی کۆرێ بەم شێوەیە بوو سەرکەوتنێکی گەورە بوو بۆ کورد هەروەها بناغەیەکی پتەوی پاڵ نەربوو بۆسەرکەوتنە مەزنەکەی شەڕی دووەمی کۆڕێ .

## چالاکیەکی گرنگی پێشمەرگە بەر لە شەڕی دووەمی کۆڕێ

خاڵێکی گرنگی کەسی پارتیزان ئەوەیە چۆن لە ساتە زەحمەت و دژوارەکاندا بیر لە وەشاندنی گورز لە دوژمنەکەی دەکاتەوە, واتە لە ساتێکدا ئەم باری سەربازی لاواز ترە لە دوژمنەکەی وە زیاتر شێوەی جەنگێکی بەرگری بەسەردا سەپێنراوە, ئەمەش ڕەنگە یەکێك بێت لە ئاستەمترین شێوازی شەڕی پارتێك, ڕێکخراوێك یان گروپێکی پارتیزان لە بەرامبەر سوپای ولاتێك دا, بۆیە لەم بارەدا شالاوی گورز وەشاندن کارێکی زۆر ئاسان نیە و بەڵکو گیانفیداکاریەکی زۆری دەوێ, لە هەمان کات دا دەبێ زۆر بەووردی ڕەچاوی خاڵە لاوازەکان و شوێنە هەستیارەکانی دوژمنەکەت بکەیت, بیرکردنەوەیەك کە دوژمنەکەت هەرگیز ئەوەی بەخەیاڵدا نەیەت . لەدوای شکستەکەی رژێم لە شەری یەکەمی کۆرێ, هەندێ فەرماندەی پێشمەرگەی کوردستان کە بریتی بوون لە (**حەسەن نەجارو هەڵگورد و قادرە سۆر ڕوستایی** ) و چەند پێشمەرگەیەکی تر بیریان لە تاکتیکێکی لەم جۆرە کردەوە, کەلەهەلّ ومەرجێکی ئاوادا هێزی پێشمەرگە بتوانێت شالاوێکی گورز وەشێن و خێرا لە بارەگا و شوێنە هەستیارەکانی دوژمن لە کۆرێ بوەشێنی, هەر بۆ ئەم مەبەستەش پلانێکیان رێکخست بۆ دەست نیشان کردنی هەندێك شوێنی زۆر گرنگ, ئێوارەی رۆژی ٩/٤/ ١٩٩١ شەهید حەسەن نجار لەگەڵ دەستەیەك لەپێشمەرگە و بە پاڵپشتی تۆپێکی ١٠٦ ملم بۆ ئەنجام دانی چالاکیەك لەناو جەرگەی سوپای رژێم لە دەربەندەکە تا شوێن و کاتی چالاکیەکە دەست نیشان بکەن کە چەند کات ژمێرێك بوو حەسەن نەجار پلانی بۆ دەکێشا, لەم بارەیەوە بەرێز سەید زەینەل پێشمەرگەی بەشدار بوو دەلێت: (حەسەن نەجار ئاگاداری ئێمەی کردەوە بۆ ئەم چالاکیە کە ئامادەبین, ئەم چالاکیە بریتی بوو لە لێدانی بنکە سەربازیەکانی دوژمن لە کۆرێ وە ئەوانەی لەگەڵمان بەشداربوون ئەو شەوە کۆمەلێك پێشمەرگەی قارەمانی

وەکو قادرەسۆر ڕوستایی و هەلگۆرد خدر و سەید ئەسکەندەر و سەید فاخیر و خالید ئەنور و خۆم و قارەمان سەدرە و چەند پێشمەرگەیەکی تر بووین کە ژمارەمان لە بیست پێشمەرگە تێنەدەپەڕی )(٢٥)



سید زەینەل ئەحمەد پێشمەرگە لە کۆرێ ١٩٩١

بەپێی ئەو بەرنامەی دانرابوو لەگەڵ ئاوابوونی خۆر و باڵکشانی تاریکی بەسەر دۆڵ وگرد و چیاکاندا, پێشمەرگەکان زۆر بەنهێنی خۆیان بکەن بە شەقام وکوچەکانی ناو گوندی کۆرێ کە شوێنی هێڵی تەماس بو لەنێوان کوردو سوپای ڕژێم, هەرچەندە ڕژێم بالآدەست تر بوو چونکە شوێنی سەنگەرەکانیان بەرزتر دەیڕوانیە سەرشەقام و

تەواوی گوندەکە, بەمەش ئەوان لە توانایاندابوو ڕێگا نەدەن هیچ جموجۆڵێك ئـەنجام بدرێ, بەرێز فەرهاد قادر پێشمەرگەی بەشداربوو لەگەڵ ئەم هێزەدا دەڵێت :

(ئەو هێزەی پێشمەرگە دوای ئەوەی پلانێکی توکمەی دارشتبوو بـۆ لێـدانی چـەند شوێنێکی هەستیار لە قوڵایی جەرگەی دوژمن, ئێوارەکەی شەهیدحەسەن نەجارِ کـە سەرپەرشتی هێزەکە بوو بۆ ئەم چـالاکیە, داوای لـێم کـرد وەك شـارەزایەك لـە نـاو گوندی کۆرێ لەگەڵیان بچم ئەوە بوو منیش لەگەڵ ئـەم هێـزە چـووم)(٢٦). هـەر لـە ئیوارە کاتێك تاریکی خەریکی پاڵ پێوەنانی دوا تیشکی ڕوناکی بـوو لـە دەڤەرەکـە ئەوکاتە توپی ١٠٦ ملمەکە لەبەرایی گوندەکە بەدەستی ڕاسـت دامـەزرا ئینجـا پێشمەرگەکان بە سێ دەستەی جیاواز دامەزران:



*قادر سۆر پێشمەرگەو فەرماندەی پارتی لە کۆرێ ١٩٩١*



حەسەن نەجا رفەرماندەی پێشمەرگەی پارتی لە کۆڕێ ١٩٩١

(سەید ئەسکەندر و خالید ئەنور و فاخیر فارس) سەرپەرشتی تۆپەکەیان دەکرد, دەستەکەی تر بریتی بوون لە: ( قادرە سۆر و سید زەینەڵ وچەند پێشمەرگەیەکی تر) کە ئەرکی هێرش کردنە سەر بەرزاییەکەی نزیك پردەکەیان پێسپێردرابوو, دەستەی سێیەم کە پێکهاتبوون لە( حەسەن نەجارو هەلگورد خدر و هەندێك پێشمەرگە ) تایبەت بوو بۆ لێدانی ئەو بنکە سەربازیەی نزیك پردەکە, تیایدا دوو تانك و کۆمەلێك سەربازی رژێمی لێبوو کە دەکەوتە رۆژئاوای گوندەکەوە. هەرچەندە دامەزراندنی سێ دەستەی وا بۆچالاکیەکی گەورە کارێکی ئاسان نەبوو.

چونکە سەرجەم ژمارەی پێشمەرگەکان بەهەر سێ دەستەکەوە خۆی لە بیست پێشمەرگە تێپەڕ نەدەکرد, بۆیە لەڕووی ژمارەوە وەك پێویست نەبوو بۆ ئەرکێکی وا بەلاّم وەك لەسەرەتاوە باسم کرد ئامانج تەنها نیشاندانی هێز بوو بە دوژمن, هەرسێ دەستەکە دوای نیو کاتژمێر گەیشتنە شوێنی مەبەست بەلاّم بۆ لێدانی سەنگەرەکانی دوژمن دەبوایە هەموو لایەك چاوەڕوانی تەقاندنی یەکەمین تۆپ بن بەڕووی دوژمن,کە (سەید ئەسکەندەر )بەم کارە سپێردرابوو, هەر بۆیە لەدوای هاویێژتنی یەکەمین گوللە تۆپی پێشمەرگە بە ئاراستەی لۆفەکانی پیرمام, ئینجا لە هەردوو قۆلّە سەرەکیەکە بە چەکی بیکەسی و کلاّشنکۆف هێرش کرایە سەر سەربازەکان و بە خەستی لێدران, هاوکات جارجاریش تۆپی پێشمەرگە ئامانجەکانی بەدروستی دەپێکا. ماوەی زیاتر لە یەك کاتژمێر و نیو شەڕ و تەقە بەردەوام بوو, دوژمن بەرگریەکی ئەوتۆی پێنەکرا پاشەکشەی کرد و شوێنەکانیان کەوتە دەست پێشمەرگە, بەلاّم لەناکاو تۆپخانەی دوژمن دەستی کرد بە کێلاّن و تەواوی ئەو ناوەی کردە ئاگر, بۆیە هێزی پێشمەرگە پەیتا پەیتا پاشەکشەی کرد بەرەو گوندی حوجران , هێزی پێشمەرگە لەم ئەرکەدا سەرەڕای وەشاندنی گورزێکی کوشندە لە دلّی سوپای رژێم خۆشبەختانە هیچ زیانێکی گیانی نەبوو , بەهەمان کات توانیان لەم چالاکیە نەبەردیەکی تر بخەنە سەر سەرکەوتنەکەی رۆژی حەوتی مانگ, هەروەهاش وانەیەك بدەنە ئەم سوپایە کەچیتر بیر لە پێشڕەوی کردن نەکاتەوە , لەئەنجام دیاربوو ئەم گورز وەشاندنەی هێزی پێشمەرگە زیانێکی کوشندە و کاریگەری دا لە دوژمن و سەرکردە سەربازیەکانی سوپای زۆر تورە کرد. بەڕێز فەرهاد قادر پێشمەرگە لە هێزەکانی یەکێتی لە کۆرێ دەلێت:



*عەولا* *ڕەش* پێشمەرگەی بەشداربووی داستانی کۆڕێ ١٩٩١

(ئەم هێرشەی ئێمە بۆ سەر سەنگەرەکانی دوژمن لە نێو جەرگەی سەربازگەکانیان زەبرێکی کوشندەبوو بۆ ئەوان چونکە ئەوان لەو باوەڕە دانەبوون پێشمەرگە بتوانێت زەبریان لێ بوەشێنێت بەم شێوەیە, خۆ ئەگەر هێزی زیاترمان هەبوایە ئەو شەوە دەمان توانی تا پیرمام ئازاد بکەینەوە )(٢٧)

گرنگی ئەو شەڕە لەوە دابوو کە سوپای ڕژێم لەو باوەڕەدانە بوو کە هێزی پێشمەرگە لە توانای دا هەبێت هێرش بکاتە سەر بنکە سەربازیەکانی ئەوان , جگە لەبەرگریکردن .

## هێرشی دووەمی سوپای ڕژێم بۆ دەربەندی کۆڕێ

سوپای ڕژێم بەهۆی شکستی خراپی لە شەڕی یەکەمی کۆڕێ دووچاری بارێکی دەروونی خراپ ببوو, چونکە بەدرێژایی شالأوەکانی ئەو هەرگیز بیری لەوە نەکردبۆوە کە جارێکی تر پێشمەرگە لەتوانای دابێت بەرگری بکات , بەتایبەتیش لە دۆخێکی واخراپ دا کەمیللەتی کورد دووچاری تراژیدیای کۆچ ڕەوی بەکۆمەڵ ببۆوە, کەئەمەش کایگەریەکی خراپی کردبوە سەر ورەی پێشمەرگە و باری سیاسی پارتەکانی کوردستان بۆ بەرەنگاری کردن " بەلأم کاتێك لە حەوتی چوار ڕژێم ئەو گورزە کوشندەییەی بەرکەوت لە شەڕی یەکەمی کۆڕێ, کەتیایدا ڕێگەی شالأوەکانی ڕژێمی دژ بە داگیرکردنەوەی کوردستان وەستاند. ئیتر سوپا بەشێوەیەکی درندانە ترو داخ لەدڵ تر بەئاگا هاتەوەو دەبوایە بە هەر شێوەیەك بێت باری ئەم شکستە گەورەیە لە کۆڵ خۆی بکاتەوە و بتوانێت زەردەخەنە بخاتەوە سەر لێوی پیاوانی بەغدا سەبارەت بە ڕەوشی کوردستان.هەر بۆیە لەماوەیەکی کورت دا خۆی ئامادە کرد بۆ هێرشێکی بەهێزو ئامادەکراو, هێرشێك کەپێشتر کردویەتی و شکاوە و خوێنی تێدا ڕشتووە .

هەڵبەتە هێزی پێشمەرگەی کوردستان لە کۆڕێ تەواو دەیزانی حکومەت لە شالأوەکانی ناوەستێ و بەهەمان کات وابە ئاسانیش شکستەکەی پێشتری لە کۆڕێ لە بیر ناکات, بۆیە سەنگەرەکانی پێشمەرگە هەموو کات وساتێك لە چاوەڕوانی هێرشێکی بەربلأوی ڕژێم دا بوون. هەتا پێش دەست پێکردنی شەڕی دووەمیش, سەرەڕای شکاندنی حکومەت لە شەڕی یەکەم دا بەلأم کەشی سەربازی ناوچەکە هەر لە سەرکەوتن و بەرژەوەندی سوپای عێراقی دابوو . هاوکاتیش کەم کەس هەبوو لە کورد لەو باوەڕە دابێت بەبێ هاوکاری نێو دەوڵەتی, کورد جارێکی تر بتوانێت سوپای عێراقی لە ناوچەکە بشکێنێ و بەهۆیەوە سەرکەوتنێکی سیاسی بەپێی

بارودۆخی ئەوکاتە بەدەست بـێنێ , بۆیـە تـا شـەڕی دووەمـی کـۆڕێش سـەرکەوتن تەمێکی لێڵ بوو بەسەر ئایندەی کوردەوە.

لە دوای شەڕی یەکەمەوە کە هێزی پێشمەرگە سەرکەوتنی بەدەست هێنـا , تـەواوی لایەنـەکانی بـەرەی کوردسـتانی هاتنـەوە بـۆ کـۆڕێ و لـە ژێـر فەرمانـدەی چـەند سەرکردەیەکی سەربازی دا توانرا تەواوی سەنگەرەکان دابەش بکرێت بە سەر هێـزی پێشمەرگەی حزبەکاندا,

بەڵام شالاّوی ئەم جارەی ڕژێم بەهێز تر و بە تاکتیکێکی نوێ و هێنـانی سـوپایەکی شارەزای زۆرترەوە پلانی بۆ دانرابوو. ئـەم شـالاّوەی ڕژێـم خـۆی لـە دوو قۆنـاغ دا دەبینیەوە :

قۆناغی یەکەم بریتی بوو لە هێرش کردنی پیـادەیی بـۆ سـەر شـوێنە گرنگـەکان و بەرزاییەکانی ڕۆژ هەڵات و ڕۆژئاوای دەربەندەکە, لە کاتی سەرکەوتنیان لەم قۆناغـە ئینجا جێ بەجێ کردنی قۆناغی دووەم دەستی پێدەکرد کە بـریتی بـوو لـە هێرشـی سەرتاپا گیری بەتانك و زرێپۆش و پیادەوە لەسەر شەقامی سەرەکیەوە بەرەو گونـدی حوجران. ئەم هێرشەی سوپای ڕژێم پێك هاتبوو لە:

١- چەند یەکەیەکی فرقەی ١٠ کە پێشتر بارەگای لە سۆران بوو.
٢- لیوایەکی پیادە .
٣- لیوایەکی پیادە و میکانیزمی .
٤- یەك ڕعیل تۆپی قورس و دورهاویژ .
٥- ڕعیل هاوەنی ١٢٠ملم و ٨٢ملم .

## قۆناغی یەکەم:

دوای سەرکەوتنی هێزی پێشمەرگە لە شەڕی یەکەم بۆ رۆژی دواتر کە ٤/٨ زۆربەی هێزی پێشمەرگەی حزب و لایەنەکانی کوردستانی گەیشتنە مەیدانەکانی ڕووبەڕوو بوونەوە. هەرلایەنە و بەگوێرەی قەبارەی خۆی هێزی نارد, بەلام هێزی سەرەکی و زۆرتر کە پێکهاتبوون لە پیشمەرگەکانی یەکیتی و پارتی کە هەر ئەوکاتە لەلایەن بەرێزان حەمیدە فندی و کۆسرەت رەسول وحەسەن کوێستانی و دکتور سەعید و ملا عبدالقادر برایەتی و نجم الدین گۆرۆنی و کانەبی گەورە سەنگەرەکان دابەش کران بۆ ئەوەی هێزەکانی پێشمەرگە بە تەواوی لەئامادە باشی دابن بۆ هەر ڕووبەروو بونەوەو شالاوێکی تری ڕژێمتەواوی دابەش کردنی سەنگەرەکان لە شەڕی کۆرێ بەم شێوەی خوارەوە بوو :

## بەری رۆژهەلات

بەری لای رۆژهەلاَت کە دەروانیتە سەر شێرەسوار, پێك هاتوە لەو زنجیرە چیایەی کە بە( **شاخی زێبکە** ) ناسراوە, زێبکە ئەم پاشایە بووە لە سەردەمانی کۆنی میری سۆرانەوە دەسەلاَت داریەتی ئەم ناوچەیەی کردوە و لەسەر ئەم شاخە قەلاَیەکی دروست کردوە بۆ ڕووبە ڕوو بوونەوەی دوژمنانی, شوێنی ئەم قەلاَیەش هەمان ئەو شوێنەیە کە دەکەوێتە ناوەراستی سەر شاخەکەو لەسەردەمانی دەسەلاَتی رژێمی بەعسیش وەك سەنگەرێکی بەهێز سودی لێوەرگیراوە لەلایەن رژێمەوە, ئەو سەنگەرەش بە سەنگەری عامودەکە ناسراوە, ئیستا کە تاوەرێکی بچوکی کارەبای تێدایە, ئەم بەرەیە درا بە هێزی پێشمەرگەی یەکیتی و زەحمەت کێشان و بزوتنەوەی ئیسلامی. فەرماندەی سەربازی ئەم لایەنانە پێك هاتبوون لە (رێباز لە یەکێتی ,

دکتۆر سەردار و مام جەوهەر لەحزبی زەحمەت کێشان, مەلا سەلمان لە بزوتنەوەی ئیسلامی هێزەکانی یەکێتی لەسەر شاخەکە دووسەنگەریان هەبوو, بزوتنەوەی ئیسلامیش سەنگەرێك, لەخوار سەنگەرەکانی یەکێتی, حزبی زەحمەت کێشانیش لە نزیك شەقام خۆیان مەلاس دابوو لە سەنگەرێك دا .




*شاخی بەری ڕۆژهەلات کە بریتی بوو لە سەنگەرەکانی هێزی پێشمەرگەی کوردستان*



پێشمەرگەکان لە نێو سەنگەرەکانی شاخی *بەری ڕۆژئاوای کۆڕێ* ۱۹۹

## *بەری ڕۆژئاوا*

بەری لای ڕۆژئاوا یاخود بلێین ( شاخی سپی ) بریتی بوو لە بەرزاییەکانی سەرگوندی کۆڕێ کەلەهەموو هەلومەرجێکدا ئەم بەرزاییانە شوێنێکی زۆر گرنگ بوون, چونکە زنجیرەی بەرزاییەکانی دەیڕوانیە سەر کۆمەلێك ناوچەی گرنگ, هەروەها پانتاییەکی بەرفراوانی لە ناوچەکە داگیر کردبوو. ئەگەر دوژمن لەو زنجیرە چیایەی بەری ڕۆژئاوای سەقامگیر بوایە هیچ هێزیك نەیدەتوانی لە حوجران و تا شەقلاوە بەرگری بکات . ئەم بەرەیە درا بە پێشمەرگەکانی پارتی و سوشیالیست و حزب الله و شیوعی و بزوتنەوەی ئیسلامی , فەرماندە و بەرپرسەکانی ئەم هێزانە

بریتی بوون خەمەد بارزانی و خدر سـوارە لـە( پـارتی ) ڕەحمـان کۆیتـەر , سـەید عبدالله لە (سوشیالیست), کانەبی گەورە و محسین یاسـین لـە (شـیوعی), ئیـبراهیم حمکۆ , قادر عسمان لە (حزب اللەی شۆرشـگێر), کەسـەرجەم سـەنگەرەکانی سـەر شاخەکە بەم شێوەیە دابەش ببوون: حزبی سۆشیالیست لە سەنگەرێکی کۆتایی شاخە بوون کە شوێنێکی بەرزتر دەیڕوانیە سەر سەنگەرەکانی تر, پارتی لە سـێ سـەنگەر دابوون , حزبی شـیوعی یـەك سـەنگەر , حـزب اللـەی شۆرشـگێر یـەك سـەنگەر, بزوتنەوەی ئیسلامیش یەك سەنگەر کە کۆی گشتی سـەنگەرەکان خـۆی لـە حـەوت سەنگەردا دەبینیەوە .

ئەوەی جێگای باسە لە بـەری ڕۆژئـاوای شـەقامی سـەرەکی کـۆریێ حـوجران هێزێکی سەر بە پارتی گەل بەسەرپەرشتی مستەفا گۆرۆنی دامەزرابوون, ئەم هێـزە لە نزیك دەربەندەکە بوون بۆ بەرگری کردن لە دژی هێرشی سوپای رژێم, ئەم دابـەش کردنەی هێزی پێشمەرگە کە لە چەندین پارتی جیـاوازی نـاو بـەرەی کوردسـتانی و ئایدۆلۆژی هەمەرەنگ پێك هـاتبوو, گەرچـی دوور بـوو لـە دارێـژراوێکی زانسـتی سەربازی بەلاَم تارادەیەك پەیوەستیەکی یەکانگیر و تێگەیشتنێکی سەربازی باشـیان لە نێواندابوو, زمانێك هەبوو ڕۆحێك هەبوو کە لوولە تفەنگەکانی لەیەك ئامـانج دا کۆدەکردەوە , ئەویش ڕۆحی پیرۆزی کوردایەتی بوو, هەرچەندە ڕەنگە بیروباوەرەکان بیری جیاوازی حزبـەکان لـە هەنـدێ جـاردا ئامانجـەکانی کوردایـەتی بـەر تەسـك کردبێتەوە بەلاَم لەو سات وکاتەی شەڕی کۆرێ دا بەرەنگاری و پارێزگاری لە خـاکی کوردستان خەونی هەموو پێشمەرگەیەك بوو.

بەرێز مستەفا گۆرۆنی فەرماندەی پێشمەرگەکانی پارتی گەل لە شەڕەکە دەلێت:
( شەڕی یەکەم بە سەرکەوتنی هێزی پیشمەرگەی کوردستان تەواو بوو ئێمە لـە وێ نـەبووین, ئەوانـەی لـەوێ بـوون کۆمـەلێك پێـشمەرگەی هێـزی بـارزان بـوون بـە سەرپەرشتی دکتۆر سەعید, بـەلاَم لـە دوای تـەواو بـوونی شـەڕ ئیوارەکـەی ئێمـە

گەیشتینە ئەو دەربەندە, هیزەکەی ئێمە کۆمەڵێك پێشمەرگە بووین لەوێ کاك حەمیدە فندی و کاك کۆسرەتم بینی کاك حەمید داوای لێ کردم هەرزوو پێشمەرگەکانم بگەینمە نێو سەنگەرەکانی پێشەوەی بەرگری ئەوەبوولەدەربەندەکە سەنگەرێکمان ڕوو بەڕووی شەقام دامەزراند لەو شوێنەی دەبابەکانی لێ شکا )(٢٨)



*مستەفا گوڕونی فەرماندەی هێزەکانی پارتی گەل لە کۆڕێ ١٩٩١*




*سەرشاخەکەی بەری رۆژ ئاوا کە چەند سەنگەرێکی هێزی پێشمەرگەی لێ بوو*

**دیارە دابەش کردنی سەنگەرەکانی بەرگری بەو شێوەیە لەسەر بناغەی هێزی حزبەکان هیچ کاردانەوەیەکی خراپی نەبوو چونکە شێوازی پێکهاتەکە دەگەڕایەوە بۆ نەبونی لەشکرێکی یەکگرتوو کە هەموو پێکهاتە و لایەنەکانی کوردستانی لە خۆگرتبێت, بەلاّم لەو کاتەدا دابەش بوونی هێزەکان بەو شێوازە سەربازیە لە رووی هونەری جەنگەوە کارێکی گونجاو بوو. یان باشتر بلێین لە ڕووی سەرکردایەتی کردن دیسپلینی پێشمەرگایەتی ئەرك و فەرمانەکان باشتر جێ بەجێ دەکران. بۆیە هەموو هێزە بەشداربووەکان سەلماندیان کە هاوکارو بەهاناچونی یەکترەوەن لە کاتی شەڕەکاندا .**

بەرێز **فەرهاد مەخموری** ناسراو بە فەدۆ مەخموری پێشمەرگەی بەشداربووی هێزەکانی یەکیتی و بەرپرسی ئەو سەنگەرەی کە لە ١١ /٤ دوژمن هێرش توندی کردە سەر و چوار پێشمەرگەی تیایدا شەهید بوون بەم شێوەیە دەگێریتەوە :

( ئێمە لە شەڕی ٤/٧ لەوێ نەبووین بەڵام کاتێك شەڕ کۆتای هات بەسەرکەوتنی هێزی پێشمەرگە لە دەربەندەکە. ئێمە ئەوکات لە شەقلاوە بووین, کۆمەڵێك پێشمەرگە بەویستی خۆمان بڕیارماندا بگەڕێنەوە کۆرێ بۆ بەرگری کردن. ئەوەبوو کۆبونەوەیکمان لە شەقلاوە ئەنجام دا. هاوکات ئێزگەی گەلی کوردستانیش بانگەوازی دەکرد بۆ بەرگری کردن و ڕووبەڕووبونەوەی سوپای دوژمن, بۆیە ئێمە ئیوارەی ٤/٨ لە دەربەندی کۆرێ بە فەرماندەی کاك ڕێباز بەرێکەوتین بۆ سەر شاخەکەی بەری ڕۆژهەڵات کە بۆمان دەست نیشانکرابوو. کەچوینە ئەوێ دوو سەنگەرمان دامەزراند.



*فەرهاد مەخموری پێشمەرگەوبەرپرسی سەنگەرێك لە بەری ڕۆژهەڵات لە کۆرێ١٩٩*



*شەهید فاروق گراوی لەسەنگەری بەری رۆژهەلات شەهیدبوو ١٩٩١*

برادەرانی زەحمەت کێشان لە خوار ئێمەوە بوون بە سەرپەرشتی دکتۆر سردار هەروەها دەستەیەك لەپێشمەرگەکانی بزوتنەوەی ئیسلامیش لە سەنگەرەکانی خوار ئێمەوە بوون کە ژمارەیان حەوت پێشمەرگە دەبوو. هەموو هێزەکەی ئێمە لەسەر شاخ نزیکەی ٣٠ پێشمەرگە دەبووین کەلەلایەن من و شەهید فاروق گراویەوە سەرپەرشتی دەکران, سەنگەرەکەی سەروتری من لەلایەن فاروقەوە سەرپەرشتی دەکرا, کە بەداخەوە هەرلەوێش شەهید بوو )(٢٩).

جگە لەو هێزانەی کە لە سەنگەرەکانی پێشەوە دابەش کرابوون , لە ناو گوندی حوجرانیش چەند هێزێکی پێشمەرگەی یەدەگ و ئامادە باش نیشتەجێ کرابوون



ئیبراهیم حەمکۆ فەرماندەی هێزەکانی حزب الله لە کۆری١٩٩١

کە بریتی بوون لەبەرێزان (کۆسرەت رەسول , حمید ئەفندی , حەسەن کویستانی, دکتۆر سەعید , سەفین مەلا قەرە , نەجمەدین گۆرۆنی, فاروق مەخموری, مەلاحەسەن , هەلگورد خدر, مقداد علی, رەحمان سەیدە, حاجی مسیفی, سەید کاکە , حەسەن نەجار , عمر عوسمان , سید حکمەت, خدر سوارە, عوزێر فەقیانی , سامی مستەفا, قادرسۆر روستایی , عەولا بۆر, مەلا عبدالقادر, عادل بەکر, تەحسین کاوانی, ئیبراهیم حەمکۆ ,قادر عوسمان. و کۆمەلێك فەرماندە و پێشمەرگەی تر ).بەریز مستەفا گۆرۆنی دەلێت :( سەرەرای سەنگەری هێلی بەرگریمان لە پێشەوە توانیمان بارەگایەك لە گوندی حوجران دابمەزرێنین تا لە کاتی پێویست سوود لەو پێشمەرگانەی ئەوێش وەربگرین )(٣٠).



*فاروق مجموری ناسراو بە فاقە فەرماندە و پێشمەرگەی یەکێتی لە کۆرێ ١٩٩١*

هەروەها ڕووبەرووی دەربەندەکەش نزیك گوندی حوجران دەستەیەك پێشمەرگە بە فەرماندەی حەسەن نەجار تۆپێکی قورسی ١٠٦ ملم و چەکێکی اس پی گی ٩ دامەزراندبوو. دکتۆر سەردار ئەندامی مەکتەبی سیاسی ئەوکاتەی حزبی زەحمەت کێشانی کوردستان کە لە شەڕەکە بەشدار بوو دەڵێت:

( ئێمە ڕۆژی ٤/١٠ هاتین بۆ دەربەندی کۆرێ, کە پێکهاتبووین لە (٢٨) پێشمەرگە. پێش ئەوەی ئێمە بگەینە کۆرێ, لە ٤/٧ پێشمەرگەکانی پارتی شەڕی بەرەنگار بونەوەیان لەگەڵ سوپای ڕژێم ئەنجام دابوو کە تیایدا سەرکەوتنیان بە دەست هێنابوو.

سەرەتا کە گەیشتینە حوجران چووینە خیمەکەی کاك کوسرەت کە حسن کویستانیش لەوێ ئامادەبوو, ئەوان پێیان وتین کە دەبێت هێزەکەمان ڕەوانەی لای بەری ڕۆژهەلاَت بکەین , ئەو شوێنەی کە ئێمە و پێشمەرگەکانی یەکیتی ئەرکی پاراستنی مان لە ئەستۆ دابوو )(٣١) لە ڕووی دابین کردنی خۆراك و ئازوقە بۆ هێزی پێشمەرگە لە سەنگەرەکاندا, چەند بارەگایەکی حزبەکان لە شەقلاوەو سۆران و سارداو ئەرکی پەیداکردن و ڕەوانە کردنیان بۆ بەرەی شەڕ لە ئەستۆ گرتبوو. بەر لە دەست پیێ کردنی هێرشی ڕژێم بۆسەر ناوچەکە, دیاربوو بەهۆی جموجۆل و لەشکرکێشی بەشێك لە یەکە سەربازیەکانی ڕژێم بێشبینی ڕووداوێك دەکرا.



تەحسین کاوانی پێشمەرگەی بەشداربووی داستانی کۆڕێ ١٩٩١

بەرێز عومەر عوسمان بەرپرس و فەرماندەی پارتی دەربارەی دەست پێ کردنی شەڕەکە دەڵێت:

( خوالێخۆش بوو جەبار کوڕێ خەبەری پێدام کە زابتێکی عەسکەری خەبەری داوە ئەم شەو هێرش دەکەن ...من بەپەلە ئاگاداری کاك حەمیدە فندی و دکتۆر سەعیدم کردوە ئاگاداری هەموو ئەوانەی پێشەوەم کرد ) (٣٢).



عومەرعوسمان بەرپرسی لقی دوو پارتی ١٩٩١

لەبەرەبەیانی رۆژی ١٩٩١/٤/١١ بە دەوروبەری کات ژمێر ٥,٣٠ لەکاتێك دا چیا و دۆڵ و بنارەکان بە خامۆشیەوە ڕاکشابوون و سەریان بەیەکەوە نابوو لە چاوەڕوانی بۆ هەواڵێکی کت و پڕ, هەورەکانیش خەریکی وەستاندنی لێزمە باران بوون بەسەر ئاسمانی پڕ لە کارەسات و خوێناوی ناوچەکە دا, زەمینێکی تەڕی بەهاری لە هوژەی

درختەکانی حوجران زیاتر هیچ نەدەبیسترا, هەموو شتێك نوقمی خەوێکی ترسناك بوو, هیچ دیارنەبوو تەنها هیوایەکی تاریك نەبێت , ئالەو ساتانەدا بەیەکەم تەقەی دوژمن هەموو شتێك ڕاپەری و لێزمەی گوللە و دەنگی تۆپ و زریکەی دەنگی جەستەی زامدار و هاواری نەبەردی پێشمەرگە چیاو دەربەند و گوندی ڕاچلەکاند. شەڕ و ئاگرباران لەماوەی چرکەیەك دا تەواوی سەنگەرەکانی تەنیەوە, لە هەردوو قۆڵەوە شالاوی دڕندانەی سوپای بەعس بە شێوەیەکی زۆر سەخت و ترسناك دەستی پێکرد.

ڕەشید حەمەدئەمین ناسراو بە ڕەشید کوڕی ئەوکاتە جێگری کەرت بوو لە هێزی پێشمەرگەی یەکێتی و دەورێکی بالاَی بینی لە ڕوو بە ڕوو بوونەوەکان لە بەری ڕۆژ هەلاَت بەم شێوەیە باس لە شەڕەکە دەکات :



ڕەشید کوڕێ لە ناوەڕاست لەگەل هەڤالەکانی لەنێو سەنگەری بەری ڕۆژ هەلاَت ١٩٩١

(ئەو شەوە من و دوو پێشمەرگە بەنهێنی چوین بۆ گوندی کۆڕێ بۆ هێنانـەوەی ئـەو پارچە چەکانەی کە پێشتر لە گوندەکـە حەشـارمان دابـوون, دوای گەرانـەوەمان بـۆ شوێنی خۆمان لەبەری رۆژهەلاتی دەربەندەکە کاك فاقە و چەند پێشمەرگەیەکم بینی کە بۆ دانانەوەی بۆسە هاتبوون ... من ئەو شەوە لە گوندی حـوجران مامـەوە دوای کاتژمێر دوانزەی شەو خەوتم, کاتێك بە ئاگایان هێنام کاتژمێر چواری بەیانی دەبـوو شەڕ دەستی پێکردبوو خـۆم و دوو پێـشمەرگە بـەناوەکانی ( **یـاقوب و حەسـەن** ) چەکەکانمان هەڵگرت و بەرەو سەرشاخەکە کەوتینـە رێگـا بـۆ ئـەو سـەنگەرەی کـە شەهید فاروق گراوی لێ بوو. شەهید رێبازو شەهید فاقـە و عومـەر کـۆڕی لـەنزیك **(تەوسکە)**وە هەلکشانە سەر شاخەکە ) (٣٣).

دیارە سوپای رژێم بۆ کەلك وەرگرتن لە بەرزی و نزمی سەر شاخەکە هەولی داوە سەرەتا سەرکەوێتە سەر لوتکە بەرزەکانەوە کە لە کۆتایی شاخەکەوەیە کە بەرلە شـەڕەکە هـیچ پێـشمەرگەی لـێ نـەبوو, پاشـان بـەرەو خـوارتر هێرشـی کـردە سەرسەنگەرەکانی یەکێتی, بەرێز سەید حیکمەت فەرماندەی پێـشمەرگەی یـەکێتی سەبارەت بە هێرشی رژێم بۆ سەر بەری روژهەلات دەلێت:

( لە سەرەتای هێرشەکە دوژمن توانی دوو شوێنی گرنگی ئێمـە داگـیر بکـات لـە یەکێکیان سێ پیششمەرگەی ئێمە شەهید بـوون وە ئـەم هێرشـە زۆر کـت و پـڕ و کاریگەر بوو بەلاّم رێگامان نەدا دوژمن جێگای خۆی قایم بکات و لەهـەمان کـات هێرشمان کردەوە سەریان و شوێنەکانمان ئازاد کردەوە ... بەم شـێوەیە دوژمـن سـێ جاری تر هێرشی کردەوە سەرمان بەلاّم شکستی هێنا و بەرگریمان کرد ). (٣٤)

بەپێی قسەکانی بەرێز سەید حیکمەت لەسەرەتای هێرشەکە سوپای رژێم توانیویەتی سەرکەوتنێکی کاتی بەدەست بێنێت و هەردوو سەنگەرە گرنگەکەی یەکێتی لە بەری رۆژهەلاّت بگرێت. بەرێز فەدۆ مەحموری کە خۆی بەرپرس و پێشمەرگەی یەکێتی بوو لە یەکێك لە سەنگەرەکانی بەری رۆژهەلاّت دەلێت:



سەید حکمەت فەرماندەو پێشمەرگەی یەکێتی لە کۆری ١٩٩١

(ئەوشەوە بارانێك باری بوو ئێمە لە سەرمان خۆمان خستبوە ناو نایلۆنەوە, لەکاتژمێر چوار و دە دەقیقە گوێ بیستی تەقەیەك بووم, کە سەیرم کرد لە پیرمام و کۆرێ دەنگی زنجیرەی دەبابە دەهات, هەستم کرد شتێك ڕوو دەدات, ئینجا نزیکەی پەنجا مەتر لە دووری ئێمە, هێرشێکی کت و پڕیان کردە سەر سەنگەرێك کە شەهید فاروق و هەندێ پێشمەرگەی تیدا بوو, هێرشەکەیان زۆر کاریگەر بوو ئەوانیش بەرگریان دەکرد, ئینجا هێرش بۆ سەر ئێمەش کرا, سەرەتا پێشمەرگەیەکمان بەناوی فاخیر شەهید بوو, بەڵام ئێمە بەردەوام بووین لە شەڕکردن, ئەوەبوو سەنگەرەکەی شەهید فاروق گیرا. ئێمە لە شەڕێکی سەخت دابووین, لەو دەمەدا کاك ڕێباز بە خۆی وچەند پێشمەرگەیەك لە حوجرانەوە بۆ پالپشتی ئێمە

هاتن, پێم ووت "خەمی ئێمەتان نەبێت بڕۆن سەنگەرەکەی سەرووتر بگرنەوە ئەوانیش بە ئارپیجی توانیان سەربازەکان بشکێنن و سەنگەرەکە ئازاد بکەنەوە, هەروەها دوای کەمێك کاك ڕێباز هەندێ فیشەکی بە پێشمەرگەیەك دا بۆ ناردین, ئەو پێشمەرگەیە ناوی یونس بووەوتی: منیش لێرە دەمێنمەوە بۆ بەرگری کردن بەڵام بەداخەوە دوای چەند چرکەیەك ئەویش شەهید بوو. هەروەها لەکاتی هێرشەکەدا سەربازێك بریندار ببوو بەڵام هێشتا بەردەوام بوو لەهێرش کردن بەنارنجۆك بۆ سەنگەرەکەی ئێمە, خۆشبەختانە نارنجۆکەکە بەر دیواری سەنگەرەکە کەوت و نە کەوتە ناومانەوە, خۆشی کوژرا ) (٣٥). دیارە هێرشی دوژمن بەهێزێکی کۆماندۆی مغاویر و هێزێکی تایبەتەوە ( **قوات خاصە**)دەستی پێکربوو, چونکە چۆنیەتی شەرکردن و خۆحەشاردان و مامەڵەکردنیان لەگەڵ ڕووبەڕووبونەوەی پێشمەرگە شێوەیەکی ئاسایی سەربازانی سوپای عێراقی نەبوو کە لە پێشتر دەبینرا, بۆیە بەرگری کردنیش شێوازێکی سەختی بە خۆیەوە بینی. ڕەشید کوڕی سەبارەت بە گرتنەوەی سەنگەرەکانی یەکێتی لە بەری ڕۆژهەڵات دەڵێت :

(کاتێك ئێمە لەسەنگەرەکەی شەهید فاروق نزیك کەوتینەوە لە ناکاو سەربازێك ڕوو بەڕوومان لە پەنا بەردێکەوە هەڵسایەوە,بەڵام بەهۆی دەست و بردی ئێمە لەبەرپەرچ دانەوەی یەکسەر کەوتە پاشەکشە کردن ئێمەش کەوتینە تەقەکردن و هێرش کردنە سەریان بۆیە لەماوەیەکی کورتدا سەربازەکانی ڕژێم سەنگەرەکانیان جێهێشت و کەوتنە پاشەکشە کردن, بەداخەوە فاروق گڕاوی لەوێ شەهید کرابوو, دیاربوو ئەو سەنگەرانەی سەرشاخەکە هەرسێکیان لەلایەن سەربازەکانەوە دەستی بەسەر گیرابوو کە دوو لەو سەنگەرانە پێشمەرگەی یەکێتی تێدابوو ئەوەی تریشیان پێشمەرگەکانی بزوتنەوەی ئیسلامی تێدابوو )(٣٦).

هێزی پێشمەرگە لە چاوترووکانێکدا توانی تەواوی سەنگەرەکانی سەر ئەم شاخەی بەری ڕۆژهەڵات بگرێتەوە سەربازەکانیش لەکاتی ڕاکردندا هەرچی کەل وپەل

و تەقەمەنی هەبوو لە نێو سەنگەرەکان بەجێیان هێشت, کە پێشمەرگەکان توانیـان سودیان لێ وەربگرن بۆ ڕاوەنانی سوپا تێك شـکاوەکانی دوژمـن. ڕێبـاز لێپرسـراوی پێشمەرگەکانی یەکێتی لە نامیلکەکەی ( **نرکەی کوردستان**) دەلێت:



ڕەفعەت عبدولا ناسراوبە *ڕێباز فەرماندەی پێشمەرگەکانی یەکێتی لە داستانی کۆری*

( شەوان لەسەر چیا دەنوستم نانمان بە زەحمەت دەست دەکەوت بە بێ بەتانی و شت لەسەر چیا دەماینەوە ئێوارە بۆ ئیسراحەت هاتمە خوارێ, نەچوم بۆ شەقلاوە هەموو برادەران لەوێ بوون زۆر بەترسەوە لە خانوێك نووستم لەگەڵ پێـشمەرگەکان بـەدڵ لەسەر چیابووم دەم نا دەم وەخەبەر دەهاتم لـە نزیـك کاتـژمێر چـوار لەگـەل نرکـەی ئارپێجی ڕاچڵەکیم و ریچنەی کلاشنکۆ ف و بیکە سی دنیای پڕکـرد هـەرزوو خـۆم بەستا و برا پێشمەرگەکانم هان دا نازانم چۆن وا زوو بەسەر شاخ کەوتم, دوو ڕەبیە لە

قۆڵی ئێمە گیرابوو, چەند شەهیدیکمان هەبوو  هێرشمان بۆ کردن لەگـەل ڕۆژهـەلات شوێنەکانی خۆمان گرتەوە ).(٣٧)

سەرئەنجام پێشمەرگەکانی بەری ڕۆژهەلات توانیان هێرش بکەنەوە بۆ سـەنگەرەکانی سەرشاخەکە کە سەربازەکان داگیریان کردبوو,سەرەڕای شەهیدبوونی چوار پێـشمەرگە بەلاَم توانیان سەنگەرەکان بگرنەوە, هەرلە هەمانبەردا دوو سەنگەری تر لەخوار ئـەم دوو سەنگەرە هەبوو یەکێکیان سەنگەری بزوتنـەوەی ئیـسلامی بـوو ئـەوەی تـریش پێشمەرگەکانی زەحمەت کیشانی لێ بـوو.بـەرێز دکتـۆر سـەردار لێپرسـراوی هێـزی پێشمەرگەی زەحمەت کێشان دەلێت:

(بەیانیەکەی کە شەر دەستی پێ کرد من ١٤ پێشمەرگەم نارد  بۆ سەر شاخی بەری ڕۆژهەلات تاکو پێش لە سوپای دوژمن بگرن,  ئەوان لە دوای شـەرێکی قارەمانانـە توانیان بە هاوکاری پێشمەرگەکانی یەکێتی,  دوژمن بشکینن  ئەوەندەی نەبرد مـن بریندار بووم  بە گوللەی دوژمن, بەلاَم پاشەکشێم نەکرد , لە بـەری ڕۆژهـەلاَت دوو سەنگەر گیرابوون کـە سـەنگەرەکانی پێـشمەرگەی یـەکیتی بـوون , بـەلاَم هـەرزوو گیرانەوە)(٣٨) هەروەها بەرێز مەلا ئیبراهیم پێشمەرگەی هێزەکانی یەکێتی لـە بـەری ڕۆژهەلاَتەوە دەلێت :

(پێشمەرگە ورەی بەرنەدا شەڕی دەستە و یەخەی لەگەل سەربازەکاندا کرد, لەوکاتەدا هێزێکی هاوڕێیانی زەحمەتکێش بەهاناوەمانەوە  هاتن  هەرزوو توانیمان سەنگەرەکانی (ئەودوو سەنگەرەی  دوژمن هاتە ناوی لە دوژمن بسێنینەوە ) (٣٩).

هەرلە سەرەتای دەست پێکردنی شەڕو هێرشی ڕژێم دوژمن توانی بووی سەنگەرەکانی هێزی پێشمەرگە داگیر بکات, هەلبەتە وا دەردەکەوێ ڕژێم بەبەرنامەیەکی توکمـە و پلانێکی سەختەوە هێرشەکەی دەسـت پـێ کـردوە , بـەلاَم بلیمـەتی و وورە بـەرزی پێشمەرگە لەوێدا گەیشتوتە ئاستێکی وا کەوێنەی کەمە, چونکە پاش داگیر کردنـی سەنگەرەکان و هەبوونی بریندارو شەهید هەر هەمان پێشمەرگە بە یارمەتی هێزێکی

کـەمی یـەدەك لـەو بـارە خـراپ و پەشـێویەدا توانیویانـە دوژمــن بـشکێننەوە و سەنگەرەکانیان بگرنەوە. ئەمەش بەراسـتی کـارێکی نەبەردیـە, چـونکە گرتنـەوەی سەنگەرە داگیرکراوەکان زۆر جیاواز ترە لە گرتنی شـوێنێك یـاخود پـلان دانـان بـۆ شالاوێك. لەلایەکی ترەوە سەختی شوێنی سەنگەرەکان بۆ گرتنـەوەی لـەکاتێك دا ڕژێم تەواو خۆی چەسپاندوە و ئامادەباشیەکی چاکی کردوە تیایدا بۆ بەرگری کردن. هەڵبەتە ئەم قارەمانیەتیەی پێشمەرگە تەنها لەبەری ڕۆژهەلات نەبوو, بەلکو بـەری ڕۆژ ئـاواش بەهـەمان شـێوە سـەنگەرەکانیان لەلایـەن دوژمنــەوە گـیراوە و پاشـان گرتویانەتەوە . هێرشی ڕژێم بۆ بـەری ڕۆژئـاوا شـێوەیەکی بـەرفراوانتری بەخۆیـەوە بینیوە, چونکە ڕووبەری بەرزاییەکەی بەرفراوانتر بـوو هـەروەها سـەنگەری زۆرتـر و پێشمەرگەی زیاتری لێ بوو,



*سەنگەرەکانی پێشمەرگە لەسەر شاخی بەری ڕۆژئاوا* ١٩

بۆیە هەرچەندە ڕژێم لەیەك کاتدا شالاوی بۆ هەردوولا دەست پێ کرد, بـەلام لەبەری ڕۆژئاواوە هێرشەکە بەرچڕو و سەختر خۆی بینیەوە. لەهەمان کات دا گوللەی تۆپ و هاوەنەکان لە گەل قەناس دا باری پێـشمەرگەی لـەهێرش کردنەکـەدا تـەواو

پەرێشان کردبوو , سەبارەت بە هێرشی ڕژێم بۆ بەری ڕۆژئاوا بەرێز باپیر ئیسماعیل پێشمەرگەی هێزی بارزان دەڵێت :

(ئەو شەوە ئێمە تەنها حەوت پێشمەرگە بووین لە سەنگەرێك لە سەر شاخ, شەوێکی سارد و باراناوی بوو پێشمەرگەکان لەسەرمان خۆیان خستبوە ناو نایلۆنەوە. لە تاریك و ڕونی بەرەبەیانی دا بینیمان هێزێکی سەربازی بەرەو ڕوومان دێت بەبێ هەستی ئێمە, تەقەمان لێ کردن بەڵام بەهۆی زۆری سەربازەکان و نزیك بونەوەیان لێمان و بریندار بونی پیشمەرگەیەکمان ناچار بوین پاشە کشە بکەین و سەربازەکان شوێنی ئێمەیان داگیر کرد ).(٤٠) دیارە ئەو شەوە ساردو باراناوی بووە, پێشمەرگەش بەهۆی شەکەت و ماندو بونیانەوە ڕەنگە بەشێکیان سەنگەرەکەیان بەجێ هێشتبێ و چەند هەنگاوێك کشابنەوە بۆ ناو دارو و درەختەکانی دواوە .



هێزی پێشمەرگە لە دەربەندی کۆڕێ ١٩٩١



*خەمەد میر حمد فەرماندەیەکی پێشمەرگەکانی هێزی بارزان لە کۆری*

بۆیە سەربازەکانی دوژمن لە ناکاو دەگەنە ناو سەنگەرەکانی ئەوان, بەڵام ئەم سەرکەوتنەی دوژمن نەوەندەی نەخایەند, پیشمەرگەکان لێیان دێنە دەست و شەڕ بەردەوام دەبێت . (خەمد میر حەمەد) پێشمەرگەی بەشداربووی هەردوو شەڕەکە کە هەردوو جار بریندار دەبێت دەڵێت:

( ئەو بەیانیەی دوژمن هێرشی کرد زۆر لە ناکاو وکت وپڕ بوو, هێرشێکی سەرتاسەری بوو لە هەردووبەرەی شەڕ. ئێمە دوو پێشمەرگەی قارەمانمان شەهید بوو لەسەر شاخەکە بەم ناوانە : (**عەلی سمایل بابکەیی و حەمەدئەمین مەلا موسی**), وە چەندین بریندارمان هەبوو) (٤١).

دیارە ڕژێم پێش دەست پێ کردنی شاڵاوەکەی بە شێوەیەکی چاوەروان نەکراو بە



شەهیدحمدامین ملا موسی



شەهیدعلی سمایل

هێمنی و بەنهێنی ڕێگایەکی سەخت و درێژیان بڕیبوو بـەرەو پێـشەوە تاخۆیـان لـە سەنگەرەکانی پێشمەرگە نزیك بکەنەوە, ئینجا هێرشـەکەیان دەسـت پـێ کردبـوو, هەڵبەتە ئەمەش کاریگەری خراپی کردبوە سەر پێشمەرگەکان کە نەتوانن بەرەنگاری تـەواو بکـەن و سـەنگەرەکانیان بـەجێ بهـێڵن, مامۆسـتا ئیـبرایم پێـشمەرگەی بەشداربووی یەکیتی لە شەڕەکەدا لە دەلێـت:

( زۆرکەم دوژمن زاتی ئەوە دەکات لەسەنگەری پێشمەرگە نزیـك ببێتـەوە دیـاربوو بەهۆی پەیدا کردنی دەلیلی باش لە ناوچەکە و بەسود وەرگرتن لە کەش وهەوای ئـەم ڕۆژە هاتبوونە دەور و بەری سەنگەرەکانی پێشمەرگە شەرەکە تادەهـات گـەرم تـر دەبوو چەندین عدد قەناسی ئەوان بۆ پێشەوە هاتبوون کە ژمارەیەك لە هـەڤالانمان بەهۆی گوللەی قەناسەوە شەهید بوون )(٤٢).

سەختی و ڕکی بەری ئەودیوی سەنگەرەکانی پێشمەرگە لە هـەردوو بـەری ڕۆژئـاواو ڕۆژهـەلات دا دەمانخاتـە حاڵـەتێکی گوماناویـەوە کەچۆن دوژمـن لـە سـەرەتاوە

توانیویەتی وابەناسانی و بەبێ بەرگریەکی ئـەوتۆ سـەنگەرەکانی پێـشمەرگە داگـیر بکات, چونکە سەختی بەری ئەودیوی چـیاکان لـە ئاسـتێك دایـە مـرۆڤ دووچـاری سەرسورمان دەکات کە چۆن پێشمەرگە نەیتوانیوە پارێزگاری لێ بکات. محسین یاسین بەرپرسێکی سەربازی حزبی شیوعی لە شەڕەکەدا دەڵێت :

(ئێمە تەنها یەك سەنگەرمان هەبوو لە سەر شاخەکەی بەری ڕۆژئـاوا ئـەویش پـێش دەست پێکردنی هێرشی دوژمن پاشەکـشەیان کردبـوو )(٤٣)هەرسـەبارەت بـە پاشـە کشەی پێشمەرگەکان لە چەند سەنگەرێکی بەری ڕۆژئـاوا کانـەبی گـەورە بەرپرسـی مەکتەبی عەسکەری حزبی شیوعی دەڵێت :

( ئەوشەوە زۆر سارد بوو پێشمەرگە لەسـەر چـیا سـەرمای ببـوو , بۆیـە هاتبوونـە خوارەوە, بەلاّم لەهەمان شەو بەیانیەکەی سوپای ڕژێم هێرشی کردۆتە ئەو شوێنانەی کە چۆل کرابوون و داگیری کردن )(٤٤).هەنـدێ لەسـەنگەرەکانی بـەری ڕۆژئـاوا پـێش هێرشەکەی ڕژێم بەهۆی سەرماو بارانی زۆرەوە شـوێنەکانی خۆیـان بـەجێ دێلّـن و چـەند هـەنگاوێك دەکـشێنەوە دواوە . بـەریز نـامق سـوارە دەربـارەی گـرتنی سەنگەرەکەیان دەڵێت:

( ئەو بەیانیەی دوژمن هێرشی کردە سەرمان لەسـەر شـاخەکە, مـن خـۆم لـە نـاو سەنگەرەکە بووم, هەروەها لە دەستە چەپی ئێمەش برایانی بزوتنەوەی ئیـسلامی و حزب اللەی شۆرشگێر سەنگەریان هەبوو. لە کاتی هێرشەکە هێزی دوژمن زۆر بە شـێوەیەکی نهـێنی و کـت وپـڕ گەیـشتنە سـەرمان, بـەلاّم ئـەوە بـوو هـەر زوو سەنگەرەکەی سەرووی ئێمە گیرا, بۆیە هێرشـی دوژمـن زۆر کاریگەرانـە بـوو بـۆ سـەرمان, دوای بەرگریـەکی زۆر ئێمـەش ناچـاربووین پاشەکـشە بکـەین و سەنگەرەکەمان چۆلّ بکەین... ئەو پێشمەرگانەی کە لە هێلی پێشەوەی بەرگری بوون بەهەموو لایەنەکانەوە ژمارەیان نەدەگەیشتە پەنجا پێـشمەرگە ) (٤٥). لەبـەری لای ڕۆژئاوا جگە لە شوێنێك نەبێت کە پێشمەرگەکانی حزبی سۆشیالیست پاسـەوانیان

لێ دەکرد, تەواوی شوێنەکانی تر گیران وکەوتنە دەست دوژمن, سەبارەت بەمانەوە و خۆراگری پێشمەرگە لەم سەنگەرە دا بەرێز مەلا کەمال پێشمەرگەی حزبی سۆشیالیستی کوردستان دەڵێت:



مەلا کمال پێشمەرگە و فەرماندەی حزبی سۆشیالیست لە کۆرێ سالی١٩٩١

( لەکاتی هێرشەکەی رژێم, بۆسەر بەری رۆژ ئاوا ئەو سەنگەرەی ئێمە تیای دامەزرابووین, هێرشی نەکرایە سەر, هیچ تەقەو پاڵەپەستۆیەکی لەسەر نەبوو, بۆیە پێشمەرگەکانمان هەر لەشوێنی خۆیان مانەوە و بونە پالپشتێك بۆ گرتنەوەی سەنگەرەکانی تر لە دوژمن) (٤٦). ئەو سەنگەرە کە کەوتبوە کۆتایی تیشەشاخەکە لە شوێنێکی بەرزترو دوورتر لە سەنگەرەکانی تر کە کۆمەلێك پێشمەرگە بە سەرپەرشتی رەحمان کۆیتەر لە نێو ئەم سەنگەرەدا مانەوە, کانەبی گەورە دەربارەی هێرشی پێشمەرگە بۆ گرتنەوەی سەنگەرەکانی پێشمەرگە لە بەری رۆژئاوا دەڵێت:

(بەیانیەکەی ئێمە لە حوجران پلانێکمان دارشت بۆ گرتنەوەی شوێنەکان. پلانەکە بریتی بوو لە هێرشێك لە سێ قۆڵەوە بۆ سەر سەنگەرەکانمان کە کەوتبوونە دەستی دوژمنەوە, بەم شێوەیەی خوارەوە قۆڵێك لەسەر شەقامەوە بەرەو سەر شاخ کە بریتی بوون لە کۆمەڵێك پێشمەرگەی لایەنەکان , قۆڵێکی تر من و سەفین مەلا قەرە و هەڵگورد و مهدی عزیز و خدر سوارە بەرەو سەر چیا , قۆڵێکی تر لە کۆتایی شاخەکەوە بەرەو سەنگەرە داگیر کراوەکان دەهاتن ئەوانیش بریتی بوون لە سەید کاکە, محسین یاسین , دکتۆر سعید , خالید ئاژگەیی )(٤٧). ئەو هێزە و هێزێکی تری پارتی بە فەرماندەی شێخ محمد نادر توانیان هێرش بکەنەوە سەر سەنگەرەکانی کە دوژمن گرتبوونی.



*خالید ئاژگەیی فەرماندەیەکی پێشمەرگەی پارتی لە کۆڕێ*

لە خوارەوەش هێزێکی تری باش لە پێشمەرگەکان هێرشیان کردە سەر دوژمن لە سەر شەقام و بەرزاییەکان, توانیان لە هەموو لایەکەوە سوپای دوژمن تێك بشکێنن .
سەید کاکە لێپرسراوی هێزی پێشمەرگەکانی سۆشیالیست دەڵێت:.

(بارزانیەکان جێگەیان گیرابوو بریندار و شەهیدیان هەبوو, بەڵام نەچوبوونە خـواریێ دکتۆر سەعید فەرماندەی هیزەکەیان بوو گوتی باهێرش بکەین, گـوتم بوەسـتە تـا بانگی ئەو پیشمەرگانەی خواریێ بکەم کە پـانزە پیـشمەرگە دەبـوون بەسەرپەرشـتی شوان و تحسین کاوانی کە یەکیتی بوون ) (٤٨).

بەر لە هێرشی هێزی پێشمەرگەی کوردستان بـۆ گرتنـەوەی ئـەو سـەنگەرانەی کـە سوپای ڕژێم گرتبوونی , لەوێوە ئەوان بە هاوەن و بیکەسـی و قـەناس تـەنگیان بـە هێزی پێشمەرگە هەلچنی بوو بۆیە گرتنەوەی ئەو سـەنگەرانە کـارێکی زۆر سـەخت بوو, لەم بارەیەوە, بەرێز محسین یاسین بەرپرسێکی سەربازی حزبی شـیوعی دەلێـت: ( من هێزێکی پێشمەرگەی حزبی شیوعیم لەگەڵ بوو کـە بـریتی بـوون لـە شـانزە پێشمەرگە بەرەو ئەو سەنگەرەی سەر شاخەکە ڕۆیشتم کە سوپا داگیری کردبوو, بەر لە سەنگەرەکە تاشە بەردێکی گەورە هەبوو ئێمە سەرەتا توانیمان خۆمان بگەیێنینـە ئەوێوە, ئینجا لەوێوە دەستمان کرد بە تەقە کردن و هێـرش بـردن و لـە ماوەیـەکی کورت دا توانیمان پاشەکشە بەدوژمن بکەین و یەکەمین سەنگەری کە گیرابـوو لـە لایەن دوژمنەوە ئازاد بکەینەوە. لە ناو سەنگەرەکە هاوەنێکی شەست ملم لیێ بوو توانیمان بەهەمان هـاوەن دوژمـن ڕاو بنـێین و بـەرەو سـەنگەرە داگـیر کراوەکـانی خواروتر هەنگاو بنێین ) (٤٩).



*سەیلنەسکەندەر پێشمەرگەو بەکارهێنەری تۆپی قورسی ١٠٦ ملم لەشەڕی کۆری ١٩٩١*

بێجگە لە خۆراگری و ئازایەتی هێزی پێشمەرگە دژی هێرشەکەی رژێم و گرتنەوەی سەنگەرەکان, هاوکات تۆپێکی ١٠٦ ملم بەسەرپەرشتی حەسەن نەجار و سید ئەسکەندەر کاریگەریەکی یەکجار بەهێزیان هەبوو بۆ سەرکەوتنەکانی پێشمەرگە. ئەم تۆپە بەشێوەیەکی جوڵە پێکراو بەکار دەهێنرا رۆڵێکی باڵای هەبوو بۆ شکاندن و لەق کردنی شوێنی سەربازەکان. هەر سەبارەت بە رۆڵی ئەم تۆپە لە شەڕەکەدا, بەرێز سەید حیکمەت دەڵێت :

( ئێمە چەکی قورسمان نەبوو جگەلەو تۆپەی کە لەلای حەسەن نەجار بوو بۆیە ئەو تۆپە کاریگەری زۆری هەبوو لەسەر تێکشانی هێزەکانی دوژمن )(٥٠).

## قۆناغی دووەمی پلانەکەی دوژمن شەڕی سەر شەقام

سوپای ڕژێم بەرنامەی گرتنی کۆڕێی بەدوو قۆناغ دانــابوو , قۆنــاغی یەکــەم ئەوە بوو کەهەردوو بەری بەرزاییەکان بگرێت و پاشانیش هێرشی تانك و زرێپۆش لە شەقامەوە دەست پــێ بکــات, هەربۆیــە ئــەو پلانــەکانی خــۆی جــێ بــەجێ کــرد و لەسەرەتاش دا سەرکەوتنێکی کاتی بەدەست هێنا, بەلاّم لەناکاودا و لە ناو گەرمەی شەڕەکەدا هەموو پلانەکانی ئاوەژوو بۆوە بەسەریدا , دووچاری شکستێکی زۆر خراپ بوو. هۆکاری سەرەکی شکستەکەی ئەوەبوو " لەکاتی گرتنی هەردوو بەری ڕۆژئاوا و ڕۆژهەلاّت, ئەو یەکسەر لەلای خۆیەوە وای دانا کەتەواو ئیتر سەرکەوتنی بەدەســت هێناوە, بۆیەش قۆناغی دووەمی دەست پێ کرد کە هێرشی سەر شەقام بــوو , بــەلاّم ئەو لەو بیر کردنەوەی دا دووچاری هەڵەیەکی یەکجار کوشندەی سەربازی بوو, چونکە جارێ نەوەستا کەبزانێت ئایــا ئــەم ســەرکەوتنەی تاچــەند مــسۆگەر کــردوە " بــەبێ مسۆگەر کردنی تەواوی سەرکەوتنی چیاکانی ڕۆژهەلاّت و ڕۆژئاوا, هێرشی پیــادە و تانك و زرێپۆشەکان لەشەقامی گشتیەوە لە کارەسات زیاتر بۆی هیچی تر نیە .





*تانکێکی تێکشکاوی رژێم لەگەل تەرمی سەربازەکان کۆرێ ١٩٩١*

بەلاّم نهێنی سەرکەوتنی شەڕی کۆرێ بۆ پێشمەرگە و شکست بۆ رژێم لەوەدا نەبوو کە ڕژێم پلانێکی سەربازی هەڵەی دارشتبێ بۆ هێرشەکە, بەلکو تاکە هۆکارێک لەپشت ئەم شکستەوەی ووره و خۆراگری و باوەڕی پتەوی پێشمەرگە بوو, کەملی دانەنا بۆ رژێم , لەساتێکی خێرا و سحر ئامێز دا هەڵی کوتایەوە سەر ڕژێم و سەرکەوتنەکەی لێکرد بە دۆزەخ, هەر بۆیە لە شالاّوی دووەمی ڕژێم بەتانك و زریپۆشەکانیەوە بەرەو حوجران نەیتوانی لە لێواری دەربەندەکە بەو لاوە دەربازی بێت. لەکاتژمێری دەووروبەری حەوت و نیوی بەیانی لەکاتێك دا شەڕی نێوان پێشمەرگەو سوپا لە هەردوو بەرزاییەکەدا بەردەوام بوو, لەو کاتەش دا رژێم هێرشی سەر شەقامی بە تانك وزریپۆش و پیادە دەست پێکرد کەبریتی بوو پێنج تانك و دوو زریپۆش و کۆمەلێك سەربازی پیادەیی .

دەربارەی ئەم هێرشە بەرێز قادر عوسمان ئەندامی سەرکردایەتی حزب اللەی شۆرشگێر و بەشداربوو لەشەڕی سەر شەقام بەم شیوەیە دەگێرێتەوە:



زرییۆش و تانکە تێکشکاوەنی دوژمن لەکۆری ١٩٩١

( ئیمە وەك هێـزی پێـشمەرگەی حـزب اللـەی شۆرشـگێر ئەوکاتـە بـە کۆمـەلێك پێشمەرگەی قارەمان بەشداریمان کرد لە داستانەکە. بـەرێز کـاك ابـراهیم حـەمکۆ سەرپەرشتی هێزەکەی ئێمەبوو, کە لەکاتی هێرش بردن بۆ سەر دوژمن بـە سـەختی بریندار بـوو, هێزێکمـان رەوانـەی سـەر شـاخ کردبـوو وە ئـەوەی ترمـان لەسـەر گۆرستانی حوجران کە دەکەوێتە سەر شەقام نزیك دەربەندەکە لە سـەنگەردابووین, کاتێك دەبابەکانی دوژمن بەرەو رِوومان هاتن ئێمە هێرشمان کردە سـەریان و بـە چەکی ئاربی جی لێمان دان, ئەو لێدانە هاوکات بوو لەگـەڵ شکـست و پاشەکـشەی سوپا لە بەرزاییەکان )(٥١).

لەکاتی هێرشی دەبابەکان بۆ ناو دەربەندەکە هێزی پێشمەرگە توانیان زرییۆشی دواوە بپێکێ و تێکی بشکێنێ .



هێزی پێشمەرگە لەکاتی تێکشکاندنی دوژمن لەکۆرێ ١٩٩١

کاتێك تانکەکان زانیان ناتوانن ئەو ئامانجەی پێیان سپێردراوە جێبە جێی بکەن, بۆیە ویستیان پاشەکشە بکەن بۆ دواوە, بەلاّم بەهۆی تێکشکانی زرێپۆشی دواوە رێگایان لێ گیرا و نەیان توانی بگەڕێنەوە, بۆیە سەربازەکان ویستیان لە تانك و زرێپۆشەکانیان بێنە دەرەوەو ڕابکەن, بەلاّم هەرچی کردیان لەبەر سێرەی تفەنگی پێشمەرگەکان دەربازیان نەدەبوو, ئەگەرچی سەربازەکانیش شەری پاشەکشەیان کرد.

بەرێز مستەفا گۆرۆنی فەرماندەی سەربازی پارتی گەل دەربارەی ئەم شەرە دەلێت:

(لە کاتی هێرشی رژێم خۆم و پێشمەرگەکانم بەرێ کەوتین بۆ سەنگەرەکانی پێشەوە, کە گەیشتینە ئەوێ شەرِ گەرم بوو, دەبابەکانی دوژمن بەرەو دەربەندەکە دەهاتن , ئەوەبوو ئێمەو هێزی پێشمەرگەی لایەنەکان لەهەموو لایەکەوە پەلامارمان دان و تێکمان شکاندن, لە دوای شکاندنی هێزەکەی دوژمن لەسەر شەقام بەشێك لەو هێزە روویان کردە بەرزاییەکان و توانیان بەهاواری پێشمەرگەکانی تری سەر شاخەوە بچن و

دوژمن بشکێنین, ئێمە دوو پێشمەرگەمان بریندار بوو بەناوەکانی ئاسۆمحەمەد و ئەحمەد هەولێری )(٥٢).



*زرێپۆشێکی تێکشکاوی دوژمن لە دەربەندی کۆرێ ١٩٩١*

بەرێز شوان ڕابەر پێشمەرگەی بزوتنەوەی ئیسلامی بەشداربووی داستانەکە لەنامیلکەیەکدا بەناوی (کۆرەو و شەڕەکانی کۆرێ ودانووستان پاشماوەی ڕاپەڕین بوون)بەم شێوەیە باس لە شەڕەکە دەکات:

(هێرشەکەی پێشمەرگە هێندە بە خەست وچر و پڕبوو هەر زوو بەزەبری ستریلەو ئاربیجیەکان دەبابەکان گڕی یان گرت و تێکشکان و سەربازە هەڵاتوەکانیش لەکەلەبەرو کونۆچکەکان کوژران و کەس بواری هەلاتن و گەرانەوەی نەبوو )(٥٣) .



*مەلا سەلمان فەرماندەی سەربازییێشمەرگەکانی بزوتنەوەی ئیسلامی لە کۆرێ*

لە کۆرێ پێشمەرگەکانی بزوتنەوەی ئیسلامیش شان بەشانی هێزەکانی تر دەجەنگان, بۆ بەرەنگار بونەوەی سوپای رژێم, تەنانەت دوو پێشمەرگەشیان شەهید بوو لەو شەڕەدا. دەربارەی شکاندنی دەبابەکان لەسەر شەقامەکان و قۆناغی دووەمی شەڕەکە بەرێز دکتۆر سەردار دەڵێت:

(لە سەرشەقامی دەربەندەکەش هێزیکی حزب الله و یەکێتی و پارتی و شیوعی و بزوتنەوە و زەحمەت کێشان و پارتی گەل توانیان بەرەنگاری زریپۆشەکانی دوژمن ببنەوە و تێکیان بشکێنن بۆیە من دەڵێم ئەوانەی ئامادەبوون لەم ڕۆژگارە سەختە لە بەرەکانی شەڕی بەرگری, ئەوانە جێگای ڕێزن, گرنگ نیە کەم بن یان زۆر بە ژمارە)(٥٤).

بەرێز سەید حیکمەت دەربارەی کۆتایی شەڕەکە بە سەرکەوتنی یـەکجارەکی هێـزی پێشمەرگە دەڵێت:

(تا کو دوای نیوەرۆ بەشێك لەو سەربازانەی کـە خۆیـان حەشـاردابوو لـە کـونج و کەلەبەرەکان نـاوە تەقـەیان دەکـرد و بـەرگریان دەکـرد هەنـدێ پێـشمەرگە بەدواوەیان بوون بەڵام لەگەڵ هاتنی نوێنەری ووتووێژی ڕژێم هـەموو شـتێك کوتـایی پێ هات و تەقە وەستا)(٥٥).



هەڵگورد خدر لەگەل پێشمەرگەکان لە سەر زرییپۆشێکی سوپای رژێم ١٩٩١

پاش شکاندنی دەبابـەکان و گرتنـەوەی سـەرتاپای بـەرەکانی شـەڕ لەلایـەن هێـزی پێشمەرگەی کوردستانەوە, سوپای ڕژێم زیانێکی یەکجار کوشندەی بەرکەوت کە بـە جێهێشتنی چەندان لاشەی سەرباز و تانك و زرییۆش و جۆرەهـا چـەکی هەمـەجۆر. لەگەڵ ئەوەدا پاش ئـەو شـکاندنە حکومـەت بەیـەکجاری دەسـتی لـە شـالاوەکانی هەڵگرت وخەونی داگیر کردنەوەی کوردستانی لە سەر خاکی کۆرێ زیندە بەچاڵ کرد.

هەر بۆیەش بەهۆی ئەم شکستەیەوە ڕاستەوخۆ گفتوگۆی پێشنیار کرد و نوێنەری خۆی نارد. سەرکەوتنی داستانی کۆڕێ بەخوێنی ئالّی سیانزە شەهیدی قارەمانی بەرگری لە خاك و نیشتمان تۆمارکرا وبریندار بوونی نزیکەی پەنجا پێشمەرگە.

شەهیدەکان ئەمانەبوون:

هێزەکانی یەکێتی لەم شەڕەدا نۆ شەهیدیان هەبوو بەم ناوانە ( **شەهید محسین عبدالکریم , شەهید فاروق گراوی , شەهید فاخیر عبدالرحمن , شەهید فرهاد , شەهید حاتەم , شەهید کارزان , شەهید یونس , شەهید هەمزە دیبەگەیی , شەهید فەرەج** ) لەگەلّ چەند برینداریك, پارتی لەسەر شاخەکە دوو شەهیدی هەبوو بە ناوەکانی (**شەهید علی سلیمان , شەهید حمدامین مەلاموسی**) لەگەلّ چەندین بریندار.



*تەرمی پیرۆزی هەردوو شەهیدی بزوتنەوەی ئیسلامی شەهید مەلا عومەر هەولێری و شەهید شیروان محمد حاجی کە لە شەڕی ١١/٤/١٩٩١ لە دەربەندی کۆڕێ شەهید بوون*

بزوتنەوەی ئیسلامی دوو شەهید بە ناوەکانی ( **شەهید مەلا عومەرو شەهید شیروان** ) لەگەلّ برینداربوونی یەك پێشمەرگە.

# ئاگربەست و گفتوگۆی رژێم لەگەل کورد دا

کاتێك رژێم درکی بەوە کرد کە ئیتر نە بەزەبری تۆپەکان و نە بە هێرشە یەك لەدوای یەکەکانیەوە توانای شکانی هێزی پێشمەرگەی نابێت لەم دەربەندە, بۆیە لەگەل تەواو بوونی شەڕ وکۆتایی شکستەکەی, لەم ساتەوەختە داکە هێشتا تەرم بریندارەکانی سوپای تێکشکاو لە شەقام وکون وکەلەبەرەکانی دەربەندەکەوە خەلتانی خوێن ببوون بەجیمابوون, لەو کاتەدا رژێم نوێنەری خۆی دەنێرێت بۆ لای هێزی پێشمەرگە وداوای گفتوگۆ و وەستانی شەڕدەکات, سەبارەت بەم ئاگر بەستە بەرێز کانەبی گەورە دەلێت:

( لەدوای سەرکەوتنی پێشمەرگە لە شەڕی دووەم یەکسەر ڕژێم ئەفسەرێکی سوپای بەناوی ( دارا ) بە ئۆتۆمۆبیلێکی مارسیدسی ڕەش نارد بۆ لای هێزی پێشمەرگە و داوای وەستانی شەڕی کرد. ئەوەبوو بەرپرس و فەرمانددەکانی کورد دوای ڕەزامەندی سەرکردایەتی ڕازی بوون بە شەڕ وەستاندن, بەرێزان کۆسرەت و حەمید ئەفندی و سەعد عبداللەو خۆم و سەفین مەلاقەرە لە حوجران کۆبونەوەیەکی بەپەلەمان ئەنجام دا سەبارەت بە داواکاری گفتوگۆ لەگەڵ رژێم, لە کۆبونەوەکەدا گەلێك بیرو ڕای جیاواز باس کران, هەندێك پێیان وابوو ئەم گفتوو گۆیە تەنها تەڵەیەکی ڕژێمە بۆ لە ناوبردنی فەرماندەکانی کورد, یاخود لە ئەنجامی شکستی سوپاکەیانەوەیە و چەندین بۆچوونی تر, لەم کۆبونەوەیە دا بریار درا تەنها چەند فەرماندەیەکی کەم بچن بۆ یەکەم دیداری رژێم, بەلاّم لەکاتی بەرێکەوتنمان چەند پێشمەرگە و فەرماندەیەکی تر داوایان کرد لەگەڵ نوینەرەکانمان بچن, بۆیە ئەوانیش چوون.ئەم نوێنەرانەی کورد بەرەو کۆرێ ڕۆیشتن کەلە نزیك پردەکەی ڕۆژ ئاوای کۆرێ ئەفسەرێکی سوپای رژێم لە چاوەروانی ئەوان دابوو کە نوێنەرانی کوردی گەیاندە لای فەرماندەی گشتی سوپای ڕژێم لە کۆرێ.

ئەم نوێنەرانەی کورد لە کاتی تێپەڕ بوونیان بە ناو کۆریَ لە هەردوو لاوە لەسەر شەقام سەرباز بەچەکەوە دانرابوون , بۆیە نوێنەرانمان لە سەر پردەکە چاویان کەوت بە گەورە بەرپرسانی رژێم کە بریتی بوون لە چوار ئەفسەری پایەبەرز, سێ یان بەپلەکانی لیواو و یەکێکیان بەپلەی عمید, هەر بە وەستانەوە لەسەر پێ کەوتنە گفتوگۆ لەگەل نوێنەری کوردی, رژێم بۆ گفتووگۆو دانوستان چوار داواکاری پێشکەشی کورد کرد. کەبریتی بوون لە مانە:



کانەبی گەورە فەرماندەی بەرپرسی هێزی پێشمەرگەی حزبی شیوعی لە کۆریَ ١٩٩١

١- چۆڵ کردنی ئەم شاخەی بەری رۆژئاوا .

٢-هەرچی کەل و پەل و چەك وتەقەمەنی کە کەوتۆتە دەستی پێشمەرگە دەبێ بدرێتەوە سوپا .

٣-ئازاد کردنی سەربازە دیلەکان .

٤- بردنەوەی تەرمی سەربازە کوژراوەکان. )(٥٦) .

ئەگەر بەووردی سەرنج بدەینە هەڵسوکەوتی سەربازیەکانی رژێم لەکاتی بەرێکەوتنی نوێنەرانی کورد بۆ کۆرێ وپاشانیش لەکاتی بەیەکگەیشتنیان لەگەل ژەنەرالەکانی سوپای رژێم بۆ گفتوگۆ, ئەوا بۆمان دەردەکەوێت کە هەر لەسەرەتاوە رژێم لە هەوڵی سەپاندنی چەند مەجێك بوو بەسەر پێشمەرگەدا, سەرەڕای ئەو شکستە گەرەیەی کە دووچاری سوپاکەی هاتبوو لەبەیانی هەمان ئەو رۆژە, بەلاّم نوێنەرانی کورد لەیەکەم بەیەکگەیشتن هەڵوێستەکانیان راشکاوانە بوو کە هیچ جۆرە مەرجێك لەلایەن سوپای رژێمەوە جێگای قبول نیە و رەتدەکرێتەوە, جگە لە وەستاندنی شەڕ نەبێت .

بەرێز کانەبی گەورە سەبارەت بە وولاّمەکانی نوێنەرانی کورد بۆ فەرماندە لشکریەکانی رژێم بەم شێوەیە دەگێرێتەوە:

( وەلاّمەکانی ئێمە سەبارەت بە مەرجەکانی رژێم بەم شێوەیە بوو:

١- ئێمە نەهاتووین بۆ داگیرکاری بەلکو ئەوە ئێوەن هاتوون خاکمان داگیر بکەن بۆیە ئەم شاخە بەخوێن پاراستومانە و چۆڵی ناکەین .

٢- سەبارەت بە دەستکەوتەکان پێیان ووتن چونکە ئەم کۆبونەوەیە کۆبونەوەیەکی مەیدانیە بۆیە ناتوانین داواکاریەکانتان جێ بەجێ بکەین تا سەرکردایەتیمان ئاگادار نەکەینەوە .

٣- هەر سەبارەت بە دانەوەی دیلەکان لە دوای سەرکەوتنی گفتوگۆ هەر دیلێك بەویستی خۆی دەتوانێت بگەرێتەوە یان بمێنێتەوە لەلامان (ئەگەرچی دیلیش نەبوە لەم شەڕەدا) .

٤- سەبارەت بە بردنەوەی تەرمی کوژراوەکان نوێنەری کورد پێی راگەیاندن دەتوانن هەر ئێستا بێن بۆ بردنەوەیان , بەلاّم بەمەرجێك نابێت بەچەکەوە بێن و لەکاتی بردنەوەی تەرمەکانیش دەبی ئالاّی سپی هەلکەن .

ئـەوان بەخۆشـحالیەوە بـە وەڵامـەکانی کـورد ڕازی بـوون , پاشـان وەك سەرەتایەك بریاردرا دوو خاڵی پشکنین دابمەزرێت , یەکێکیان لە لای ڕژێم لە کـۆڕێ ئەوەی تریش لەحوجران لەلایەن هێزی پێشمەرگەوە, ئینجا لەلایەن سوپاوە ئەفسەرێك بەپلەی مقدم بەناوی (غازی) دەست نیشان کرا بـۆ مەبەسـتی پەیوەنـدی کـردن لـە نێوانمـان, لەلایـەن کوردیـشەوە سـەفین مەلاقـەرە دەسـت نیـشان کـرا بـۆ هـەمان مـەبەست)(٥٧).

ئەو ئەفسەرەی کەلەلایەن رژێمەوە دیاریکرا بۆ پەیوەندی نێـوان ڕژێـم و پێـشمەرگە لەکۆڕێ ناوی ( مقدم غازی ) بوو سەر بەبارەگای فرقەی دەی سوپای عێراقـی بـوو کە پێشتر بارەگای لە ناوچەی سۆران بوو, کەسێکی شارەزابوولە جۆری هەڵـسوکەوت کردن و پەیوەندی کردن لەگەڵ لایەنی بەرامبەر, هەر لـە دوای گەڕانـەوەی نوێنـەری کورد لە یەکەم چاوپێکەوتن لەگەڵ فەرماندە سـەربازیەکانی ڕژێـم, لیژنەیـەك بـە لێپرسـراوەتی مقـدم غـازی لـە سـوپای ڕژێـم هـاتن بـۆ بردنـەوەی تـەرمی کوژراوەکانیان.کاتێك فەرماندە سەربازیەکانی ڕژێم گەیـشتن بـەو بـاوەڕە کـە هێـزی پێـــــشمەرگە نـــــە بەشـــــەڕ و نەبەناشـــــتی ملکەچـــــی بڕیار و مەرجە دوژمنکارەکانیان نابن, ئیتر ئەوەندەیان بۆمایەوە خۆشحالی دەربڕن سەبارەت بەم بەیەکگەیشتنەو وەستاندنی شەڕەکە. لەلایەکی ترەوە سەبارەت بە تانك و زرێپۆشەکانی سوپای ڕژێم کە کەوتوبونە دەستی هێزی پێـشمەرگەوە محـسین یاسـین دەڵێت:

(لەکاتی گفتوگۆدا ئەفسەرێکی سوپای ڕژێم هـات و داوای یـەکێك لـەو تانکانـەی کردەوە کە کەوتبونە دەستی پێشمەرگە, ئێمە نەمانزانی مەبەست لە بردنەوەی تەنها ئەو تانکە چیە چونکە لەسەرەتاوە پێمان ڕاگەیاندبوون ناتوانن تانك و دەبابـەکانتان بەرنەوە, بەڵام ئەوان تەنها ئەو تانکەیان لا گرنگ بوو, بۆیە ئێمە رازی نەبووین بـە بردنەوەی و نەمان دانەوە )(٥٨). داواکردنەوەی ئەم تانکـە لەلایـەن سـوپای ڕژێمـەوە

هۆکارێکی شاراوەی لە پشتەوە بوو بەلاَم لەو رۆژگارە دا کەسانی پسپۆرو شارەزا لــە بوارە گرنگەکانی تەکنیکی سەربازی لە ریزەکانی هێزی پێشمەرگە نەبوو تا بتوانن پشکنین بۆ ئەم تانکە بکەن ناخۆ بۆچی رژێم بەدەست هێنانــەوەی ئــەم تانکــەی وا لامەبەستە. دەربارەی ئەو رووداوەی کە دوای تێپەربوونی رۆژێك بەسەر وەستانی شەڕ ودەستپێکردنی گفتوگۆ لە نێوان پێشمەرگە و سوپای رژێم ڕویدا رەشید کوڕی دەڵێت:

( دوای تێپەڕ بوونی رۆژێك بەسەر هاتنی وەفدی گفتوگۆ بۆ کوڕێ دوو پێشمەرگەی ئێمە بەناوەکانی (وەیسی حەمەد ئەمین و حاتەم حەمەد ئەمین) بۆ هەندێ کاری تایبەتی خۆیان دەچنەوە ناو گوندی کوڕێ بەلاَم لەرێگادا ڕوو بە ڕووی سەربازەکانی رژێم دەبنەوەو بەبرینداری دەکەونە دەستی سوپا و دەستگیریان دەکەن, منیش ئەم هەواڵەم بە کاك کۆسرەت ڕاگەیاند و پێشنیارم کرد بەو حەوت سەربازە بگۆردرێنەوە کە رۆژی پێشتر لە کاتی هێرشەکەی رژێم بە دیل گیرابوون, کاك کۆسرەت داوای لە ئەفسەرێکی رژێم کرد بۆ ئازاد کردنی پێشمەرگەکان, ئەوەبوو دوای چوار رۆژ رژێم پێشمەرگەکانیان ئازاد کرد ئێمەش سەربازەکانمان بۆ ناردنەوە ) (٦٠).

سەبارەت بەو کۆبونەوەی کە لە شەقلاوە لە نێوان حزبەکانی کوردستان ئەنجام درا محسین یاسین دووبارە دەڵێت:

(کۆبونەوەی شەقلاوە یەکەمین کۆبونەوەی لایەنەکانی بەرەی کوردستانی بوو سەبارەت بەوەستانی شەڕ و دەست پێ کردنی گفتوگۆ , ئەم کۆبونەوەیە بەسەرۆکایەتی بەڕێز مسعود بارزانی بەڕێوە چوو هەموو لایەنەکانی تێدا بەشداربوون. داوای بیروبۆچونی ئێمەیان کرد وەك حزبی شیوعی, منیش لەوەلاَم دا پێم ووتن ئەوەی باش بێت بۆ چارەسەرکردنی کێشەی میللەتەکەمان ئێمەش لەگەڵی داین )(٤٩). دوابەدوای یەکەمین بەیەك گەیشتنی فەرماندەکانی هێزی پێشمەرگە و سوپای رژێم لەمەیدانی جەنگەوە, ئینجا بەرەی کوردستانی وەفدێکی بالاَی نارد بۆ

بەغدا کـەپێك هـاتبوو لـەم بەرێزانـە ( عومـەر فـەتاح,  فـازل میرانـی, فەریـدون عبدالقادر, ئازاد بەرواری) لە شاری بەغدا لەلایەن بەرپرسە بالآکانی حزبی بەعسەوە پێشوازیان لێکرا, لێرەوە بە شێوەی پراکتیکەوە دانیشتنەکانی کـوردو رژێـم کەوتـە قوناغی دەستپێکەوە, بەلآم هەر لەیەکەم دیـدار بەرپرسـانی رژێـم داوایـان کردبـوو بەرێزان مام جەلال و مەسعود بارزانی بێنە ناو پرۆسەی دانووسـتانەکان, ئینجـا بـۆ جاری دووەمیش کە مام جەلال سەرکردایەتی وەفدی کوردی کرد بۆ دانووسـتاندن لـە بەغدا, مسعود بارزانی لەبری خۆی نێچیروان بارزانی نارد, بەعسیەکان ئامادەبوونی بارزانیان لە گفتوگۆکـان  زۆر لا مەبەسـت بـوو, بـەلآم  بـارزانی لەسـەرەتاوە نـەی دەویست لەنزیکەوە بەشداری دانووستانەکان بکات هۆکاری ئەوەش رەنگـە نـەبوونی متمانە بێت بە سەرۆکی عێراقەوە بۆیە لەمیانەی گفتو گۆیەکدا مسعود بارزانی پێی وایە کەچوون بۆ بەغدا بۆ ئەو " دژوارترین بریار" لەهەموو ماوەی ژیانی دابـوو  وە دەڵێـت  هیچ کەس وەکو من بەباشی سەدام حسێن ناناسێ...هیچ کەسیش بە ڕادەی سەدام خراپەی لەگەڵ من نەکردوە بەلآم  نەمدەویست  بۆچونێکی  ئەو تۆ بێتە ئاراوە کە دوژمنایەتی شەخسی وهەستی تۆڵەنەستێنی بنەماڵەییم لەگەڵ حکومەتی عێراق هەیە, چونکەئەو چەند کەس لەئەندامانی بنەماڵەکەمانی ئیعدام کردوە و لە ئاکامدا نامەوێ بەشوێن رێگە چارەیەك بۆ ئەم پرسە"بگەرێم )(٦١) .

# سەرئەنجام

بەکۆتایی هاتنی بەسەرهات و گێرانەوەی شـەڕی کـۆریێ چـەند دەرئـەنجامێکمان بـۆ دروست دەبێت کە زەقترینیان ئەوەیە ئەم شەڕە نەبەتەنها لایەنێك رۆڵی تیا بینیـوە و نەبەتەنها لایەنێك شکستی بەرکەوتوە, بەهەمان کات کەسـیش قارەمـانی یەکـەم و سمبولی سەرکەوتنی شەڕەکە نەبوە تەنها پێشمەرگە نەبێت بەگشتی , هەڵبەتە ڕەنگە کەم تا زۆر کەسێك یان لایەنێك لە بەرەنگاریەکەدا رۆڵی بەرچاو و شکستی بەرچاوی هەبووبێ, بەڵام بەهۆی تێکەڵی و هاریکاری لایەنەکان سەرکەوتن و قارەمانیەتیکـە بەشێوەیەکی سروشتی و میکانیزمی دابـەش بـووە بەسـەر هـەمووان دا کەئەمـەش نیشان دانی خودی راسـتیەکانە و وەڵام دانەوەیـەکی زۆر بەجێیـە بـۆ ئـەو لایـەن و کەسـایەتیانەی سـالانێکە خۆیـان بەتاکـە قارەمـانی داسـتانی کـۆریێ دەزانـن.

بەخوێندنەوەی هەمەلایەنەی شەڕی کۆریێ تێدەگەین کە سەرکەوتنی ئەم شەڕە چـەند گرنگیەکی هەیە بۆ کورد و بزوتنەوە ڕەواکەی, لەلایەکەوە پاراستنی گیانی سەدان و هەزاران هاوولاتی کورد کە لە رێگادابوون بەرەو سنورەکان, لەلایەکی تـرەوە چـۆك دادان بەرژێم بۆ دانووستان و هـەلگردنی ئـالای سـپی. ئەمـەش خـۆی لـەخۆی دا هەبوون و زیندویەتی بزوتنەوەی سیاسی کورد دەسەلمێنێ لە بـەردەوامی خـەبات و تێکۆشان بۆ کێشەکەی, بەتایبەتیش بەشداری کردنی سـەرتاپای پارتەسیاسـیەکان و گیانی هاوکاری لەگەڵ یەکتری. بۆیە ئەم سەرکەوتنە پێمان دەڵێت لە کاتە چارەنوس ساز و تەنگانەکانی گەلی کوردا چ جوانیەك و سەرکەوتنێك دادەبـاریێ بەسـەرماندا, کاتێك بەرگی حزبایەتی فرێدەدەین و سەنگەرەکانمان دەکەین بەیەك, سـاتێك خـوێنی شەهیدانمان تێکەڵاو دەبێت و بە تێکەلاو بوونی ڕەنگـی حزبایـەتی کـاڵ دەبێتـەوە و ئازارەکانمان لە ناو جەستەی یەکتری دا دەتوێتەوە .

قسه و چاوپێکەوتنەکانی ئەم هەموو قارەمان و پێشمەرگەیەی حزبەکان لەم کتێبەدا دەربارەی شەڕی کوڕێ ئەو زەنگە بە گوێمان دا دەچرێت کە شکست و سەرکەوتنی شەڕی کوڕێ, شکست وسەرکەوتنی هەرئەندامێکی حزبێکە لەو پەڕی چەپەوە بۆ ئەوپەڕی راست , لەوپەڕی ئیسلامی و نەتەوەییەوە بۆ ئەوپەڕی کۆمەنیست و نێونەتەوەیی. کاتێك سەنگەرەکانمان لەلایەن دوژمنەوە دەگیرێن یەك خەم بەسەرماندا دادەبارێت, کاتێك هەڵدەستینەوە لە گلان و تێدەکۆشین و هیلاك دەبین تەنها ئاهێك و یەك هەناسە لێمانەوە دێتە دەرێ, کاتێکیش سەردەکەوین تەنهاو تەنها یەك زەردەخەنە لەڕوماندا دادەبارێت. ئێمە خاوەنی یەك دایکین ئەو دایکەش نیشتیمانە, ئیتر هەررەنگ و گۆرانیەك وخەونێکمان هەبێت ئێمە رۆڵەی نیشتیمانی کوردین.

## دەقی بانگەوازەکەی بەرەی کوردستانی بۆکۆمەڵگای نێو دەوڵەتی لە:١٩٩١/٤/١

دەقی یادشتی بەرەی کوردستانی بە بۆنەی سەرکوتکردنی ڕاپەڕینی ئازاری ١٩٩١ وکۆڕەوی ملیۆنی خەڵکی کوردستان

بەڕێز:جۆرج بۆش سەرۆك كۆماری وڵاتە یە کگرتووەکانی ئەمریکا

بەڕێز:جۆن مێجەر سەرۆك وەزیرانی بەریتانیا

بەڕێز:فرانسوا میتەران سەرۆك كۆماری فەرەنسا

بەڕێز: دیکوێلار سکرتێری گشتی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان

بەڕێزان:ئەندامانی ئەنجومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتی

بەڕێزان:کەسایەتیەکان کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیرەکان و ڕای گشتی نێودەوڵەتی و ڕێکخراوە نێودەوڵە تیەکان.

سڵاوڕێز..

ڕژێمی عێراق بە ئاگرو ئاسن ڕووبە ڕووی نارەزایی و خۆنیشاندانە ئاشتیە کانی گەل عێراق بۆوەو نوقمی خوێناوی کردن. ئەمە بەرادەیەك بوو کە کار گەیشتە یێکدادانی جەکداری لەگەڵ شار بەتایبەتیش لە شارە کوردییەکان.حکومەتی عێراق هەڵساوە بە ئەنجامدانی تاوان و قسابخانەی درندانەبەرامبەر بە هەزاران لە دانیشتوانی مەدەنی کورد لە منداڵ و ئافرەت و پیاو.هەروەك لە هەفتەی رابردوودا لە شاری کەرکوك و توزخورماتوو و ئالتون کۆپری وقەرەهەنجیرو شوێنەکاننی تر.ڕوویداوە.ئەمە جگە لە هەزاران قوربانی دیکە بە هۆی بۆمبارانی ئاسمان و توپباران وموشەك باران لە کەرکوك وسلێمانی و هەولێر و دهۆك و شارەکانی تر. لە ئەنجامی ئەوەش زیاتر لە ٢ ملیۆن کەس ئاوارە بوون و لەم کەش و هەوا ساردەدا پەنایان بۆچیاو دۆڵەکان بەردووە ئەوانە بە دەست برسیەتی و ترسەوە دوای چەند مانگی لە ناپلوقە دەناڵێنن.

تێبینی ئەومان کردوە کە کۆمەڵگای نێوە دەوڵەتی سەرەڕای جەخت کردنەوەی بەردەوامی لەوچەند مانگەی رابردوودا لە سەر سەرکۆنە نکردنی رژێمی سەدام حوسێن بە هۆی ئەنجامی تاوانی پاکتاو کەردنی گەل کوردو پێشێلکەردنی مافی مرۆڤ لە عێراق. کە جی(کۆمەڵگای نێودەولەتی) دەستر رژێمی سەدامی ئاوەڵا کرد تا ڕاپەرینی جەماوەری گە ل عێراق سەرکوت بەکات. بە تایبەتی لە کوردستانی عێراق و هەڵسێ بە ئەنجام دانی قسابخانە و لەناو بردنی بە کومەڵی خەڵکی مەدەنی.

ئێمە بە ناوی مرۆڤایەتی و بە هاکانیەوە بانگتان دەکەین کە بەرپرسیاریەتی ئەدەبی و مروڤانە بەرامبەر گەل کورد بە شێوەیەکی تایبەتی و دەرهەق بە گەل عێراق بەشێوەی گشتی لە ئەستۆ بگرن و تکاتان ل دەکەین کە،

١. پەلە بکەن لە ناردنی کومەك و کەل و پەل خوراکی و تەندروستی و چادرو هەر پێداویستیەکی روژانەی ژیان بۆ ئاوارەو هەڵاتوەکان. بۆ هەمان مەست داوا لە نەتەوەیەکگرتوەکان و خاچی سوری نێودەولەتی و نێوندە نێودەولەتیەکانی تر بکەن

٢. کار بو ئەوە بکەن. کە ئەنجومەنی ئاسایشی نێوە دەولەتی ناچار بکەن تا ڕێژێمی سەدام حوسێن وریا بکاتەوە ناچاری بکەن(واتا سەدام ناچار بکەن) کە سوپاو چەکە کوشندەکەی دژی ڕۆڵەکانی گەل بێوەی بە کارنە هێنێ. وەبە هەمو ڕێگاکانی تر گوشار بخەنە سەر رژێم تا هەڵمەتەکانی ڤڕکردن لە دژی ملیۆنان هاوڵاتی لە کوردستانی عێراق بوەستێنێ و وە یارمەتی سەرجەم گەل عێراق بدەن. تا بتوانێ لە ڕێگای نە تەوەیەکگرتوەکانەوە بریاری لە مافی چارەنوسی خۆی بدات بە تایبە تی کەرابەرین وەك ڕاپرسیەکی گشتی گەل شکۆ گومانی لە سەر ئەو راستیە نە هێشت کە ئەو رژێمە نوێنەرایەتی گەل عێراق ناکات .

لە گەڵ ڕێزو پێزانینمان

مسعود بارزانی

بەرەی کوردستانی عێراق

١٩٩١/٤/١

# بەڵگەنامەی ئەنجوومەنی ئاسایشی نیودەوڵەتی سەبارەت بە پاراستنی کوردان

<u>**نامە بەڵگە**</u>

**دەقی بڕیاری ئەنجومەنی ئاسایش ژمارە ( ٦٨٨ ) کە لە ٥ی نیسان (ئیپریل)ی ١٩٩١ دەرچووە**

ئەنجومەنی ئاسایش کە ئەرکەکان و بەرپرسییەکانی خۆی رەچاو دەکات ، بەپێی پەیمانی نەتەوە یەکگرتوەکان سەبارەت بە پاراستی ئاشتی و ئاسایشی نێو دەولەتیەوە، کە ئاماژە بە برگەی ٧ی مادەی ٢ی پەیمانی نەتەوە یەکگرتوەکان دەکات زۆر نیگەرانە لە ئاستی ئەو سەرکوتییەی توشی خەلکی مەدەنی عێراق دەبێ ، لە چەند بەشێکی زۆری عێراقدا کە بەو دوایە ناوچە کورد نشینەکانی گرتەوەو، بووە هۆی دەرپەرینی پەنابەران بە شێوەیەکی فراوان لە سنورەوە کەوا هەرەشە لە ئاشتی و ئاسایشی نێو دەولەتی لە ناوچەکە دەکات ، کە هەست بە نارەحەتیەکی ئیکجار زۆری لەو ئازارە بەردەوامەی کە مرۆڤ لە وێدا دووچاری دەبێت دەکات ، کە لەی سەر کوتکردنەوە دیەو ، کە ئاگاداری ئەو دوو نامەیە کە هەردوو نوێنەری هەمیشەیی تورکیا و فەرەنسا لە نەتەوە کەگرتوەکاندا ناردویانە بە مێژووی ( ٢و٤ ) ی نیسانی ١٩٩١/ یەك لە دوای یەك ( S , ٢٢٤٣٥ – S , ٢٢٤٤٧ ) و کە پسانەوە ئاگاداری ئەو دوو نامەیە کە نوێنەری هەمیشەیی کۆماری ئێران لە نەتەوە یەکگرتوەکاندا بە مێژووی ٢ و ٤ ی نیسانی / ئیپریلی ١٩٩١ یەك لە دوای یەك بە مێژووی( S , ٢٢٤٣٦ – S , ٣٢٤٤٧ ) ناردوویەتی ، کو پابەند بوونی هەموو دەولەتانی ئەندام بەرامبەر سەروەری پاسای عێراق و هەموو دەولەتانی ناوچەکە و سەلامەتی هەرێمایەتی سەربەخۆیی سیاسیان دووپات دەکاتەوە .

کە راپۆرتی ئەمیندارى گشتی بەمێژووی ٢٠ی ئادار / مارسی ١٩٩١ ( S , ٢٢٤٣٦ ) لەبەر چاو دەگرێ .

١ – ئەو سەرکوتکردنەوەی دانیشتوانی مەدەنی عێراقی کە لە زۆر شوێندا لە عێراق و کە بەو دوایە ناوچە کوردنشینەکانی گرتەوەو ئەنجامەکانی هەرەشە لە ئاستی و ئاسایشی نێودەولەتی لە ناوچەکەدا دەکەن ، مەحکوم دەکات.

٢ – داوا دەکات کە عێراق هەر دەستبەجێ ، وەك بەشداری کردنی لە ئەهێشتنی ئەو مەترسییەی کە هەرەشە لە ئاشتی و ئاسایشی ناوچەکە دەکات ئەهێلێ ، ئەم سەر کورتکردنە بوەستێنی و هیوادارە لە خودی رەوتەکەدا ، دایەلۆگەکی کراوە بۆ رێزلێنانی مافی مرۆڤ و مافی سیاسی هەموو هاولاتیانی برەخسێنێ ،

٣ – سوورە لەسەر ئەوەی کە عێراق دەستبەجێ رێگە بە گەیشتنی رێکخراوی نێودەولەتی مرۆڤایەتی بدات ، بۆ هەموو ئەوانەی پێویستیان بە یارمەتی هەیە لە هەموو لایەکی عێراقدا و ، هەموو ئاسانکاری پێویست بە پرۆسەکانی دابینبکات .

٤ – داوا لە ئەمیندارى گشتی دەکات کە لەتەقەلا مرۆیەکانی لە عێراقدا بەردەوام بێ و ئەگەر مەسەلەکە پێویستی کرد ، لەسەر ئەوەی شاندێکی دی بۆ ناوچەکە بنێرێ ، راپۆرتێك دەربارەی ئەحامەتی دانیشتوانی مەدەنی عێراق پێشکەش بکات بەتایبەتی دانیشتوانی کورد ، ئەوانەی دووچاری هەموو شێوەکانی سەرکورتکردن بوون کە دەسەلاتدارانی عێراق رەفتاری دەکەن .

٥ – هەروەها داوا لە ئەمیندارى گشتی دەکات کە هەموو ئەو دەرامەتەی لە ژێر دەسەلاتیدایە بەکاریان بێنێ ، بەی دەزەمەتانەی نەتەوە یەکگرتوەکانیشەوە کە پەیوەندیان بە راپەراندنی بەپەلە هەیە بۆ وەدەنگەوە هاتنی پێویستیە زەرورییەکانی پەنابەران و دانیشتوانی دەربەدەری عێراق .

٦ – داوا لە هەموو دەولەتانی ئەندام و هەموو رێکخراوە مرۆیەکان دەکات ، کە بەشداری لەم تەقەلادانەی فریاکەوتنی مرۆیی بکەن .

٧ – داوا لە عێراق دەکات کە هاوکاری لەگەل ئەمیندارى گشتی بکات لە پێناو جێبەجێکردنی ئەم ئامانجەدا .

٨- بڕیار دەدرێ کە ئەم مەسەلەیە بەبەرچاو بمێنێتەوە .




**نەخشەی دیاریکردنی ناوچەی ئارام بۆ پاراستنی کورد بە پێی هێڵی٣٦ ساڵی ١٩٩١ .(٦١)**




*نەخشەی هێرشی سوپای رژێم بۆ داگیرکردنەوەی کوردستان لە ساڵی ۱۹۹۱(٦٢)*




نەخشەی دەربەندی کۆزێ لەگەڵ هەردوو بەری شاخی رۆژ هەڵات و رۆژ ئاوا ودیاری کردنی سەنگەرەکانی هێزی پێشمەرگە

**_تێبینی:**

بەداوای لێبوردنەوە لە هەموو ئەو بەرێزانەی کە لە رۆژانی سەختی داستانی کۆڕێ بەشدار بوون و لەبەر هەر هۆیەك بێت نەم توانی چاوپێکەوتنیان لەگەل بکەم یاخود لەبیرم چوبێ ئاماژەیان پێبکەم و ناویان بهێنم.دەستەبەرکردنی زانیاری دەربارەی ڕوداوێکی وا یاخود دەستەبەرکردنی هەموو کەسایەتیەکانی ناو ئەم داستانە بۆ چاو پێکەوتن وئاخاوتن کارێکی ئاسان نیە, سەرەڕای هەولێ زۆرم بۆ جێبەجێکردنی, بەلآم ئەگەر نەمتوانیبێ بەپێی پێویست سەروەری وقارەمانێتی کەسانێك لەناو پەراوەکانی ئەم پەرتوکەدا تۆمار بکەم, لەگەلّ دووبارە داوای لێبوردن بەئومێدی ئەوەی ئەگەر دەرفەت هەبێت لە ئایندەیەکی درێژدا پەرە بەچەند لایەنێکی تری ئەم سەرکەوتنەدەدەین بەبەشداری هەموو لایەك, وەهەرکەسێك تێبینی یاخود زانیاریەکی تری هەبێت دەتوانێت لەرێگای ئەم ئیمایلەوە پەیوەندیم پێوە بکات بە سوپاسەوە چاوەروانی سەرنج و تێبینیەکانی بەرێزتانم .

(wria-2012@ hotmail.com)

## سەرچاوەکان :.


١- پەرتووکی ( سەدام حسین )پانۆرامانی سیاسەتی خوێناوی لاپەرە ٦٩.

٢- پەرتووکی بیرەوەریەکانی نێردراوی یەکێتی سۆڤیەت بەرێز یەڤگینی پریاکۆف .

٣- گۆڤاری ڕاپەڕین ژمارە (٢) لە سالی ١٩٩١ لاپەرە (٢٠) لەلایەن بزوتنەوەی ئیسلامی لە کوردستان دەردەچوو.

٤- گۆڤاری دیمۆکراسی ژمارە (٦) لە ١٩٩٢/٣/١ لاپەرە (١٠) .

٥- پەرتووکی جەنگی کەنداو گومانەکانی سەرکەوتن لە وەرگێرانی علی میرزا عارف هەورامی لاپەرە (٢٧٠) .

٦- پەرتووکی جەنگی عێراق لەنوسینی لۆرانس کابلانو ویلیام کریستول لە وەرگێرانی عەبدلکەریم عوزێر لاپەرە (٨١) .

٧- پەرتوکی سیستەمی نوێی جیهانی ودۆزی کورد بەرێز( عمر نورالدین) لاپەرە (١٨١) .

٨- هەمان سەرچاوەی پێشوو .

٩- هەمان سەرچاوەی پێشوو .

١٠- نامیلکەی مجاهیدینی خەلق, وەرگێرانی لە ئینگلیزیەوە لەیلا حەمید.

١١- چاوپێکەوتنی تایبەتی مهدی یونس پێشمەرگەی بەشداربوی هێرشەکە

١٢- چاوپێکەوتنی تایبەتی لەگەل بەرێز مزەفەر سالح پێشمەرگە لە هێزەکانی یەکێتی نەوکاتی .

١٣- چاوپێکەوتنی تایبەتی لەگەل بەرێز صەمەدحەمەدنەمین پێشمەرگە سەربە هێزەکانی یەکێتی نەوکاتی.

١٤- رۆژنامەی کوردستانی نوێ ژمارە (٣٩٤٠) لە ٢٠٠٦/٤/١١.

١٥- پەرتوکی ڕاپەرینی ئازاداری ١٩٩١ لەباشوری کوردستان لە نوسینی بەرێز ئاراس عبدالرحمن مستەفا لاپەرە (٤١٢).

١٦- پەرتووکی سیستەمی نوێی جیهانی ودۆزی کورد بەرێز( عمر نورالدین)لاپەرە (١٥٦).

١٧- پەرتوکی راپەرینی ئاداری ١٩٩١ لە باشوری کوردستان لە نوسینی بەرێز ئاراس عبدالرحمن مستەفا لاپەرە (٤١٨).

١٨- پەرتوکی بیرەوەری پێشمەرگەیەك لەنوسینی سەید کاکە لاپەرە(٢٥٤) .

١٩- ئەرشیفی ڕاپەرین و کۆچ ڕەو و داستانی کۆرێ .
٢٠- چاوپێکەوتنی کەی تی ڤی لەگەل بەرێز سەید کاکە لە یادی داستانی کۆرێ.
٢١- چاوپێکەوتنی کەی تی ڤی لەگەل بەرێز قادر عوسمان لە یادی داستانی کۆرێ.
٢٢- چاوپێکەوتنی گولان تی ڤی لەگەل بەرێز حەمیدە فندی لە یادی داستانی کۆرێ سالی ١٩٩٨.
٢٣- چاوپێکەوتنی کەی تی ڤی لەگەل بەرێز سەید کاکە لەیادی داستانی کۆرێ.
٢٤- رۆژنامەی کوردستانی نوێ ژمارە (٣٩٤٠) لە ٢٠٠٦/٤/١١.
٢٥- چاوپێکەوتنی تایبەتی لە گەل بەرێز سەید زەینەل ئەحمەد پێشمەرگەی بەشداربوو لە داستانی کۆرێ.
٢٦- چاوپێکەوتنی تایبەتی لە گەل بەرێز فەرهاد قادر شورتە پێشمەرگەی بەشداربوو لە داستانی کۆرێ .
٢٧- هەمان سەرچاوەی پێشوو.
٢٨- چاوپێکەوتنی تایبەتی لە گەڵ مستەفا گۆرۆنی بەرپرس و فەرماندەی هێزەکانی پارتی گەلی دیموکرات لە داستانی کۆرێ .
٢٩- چاوپێکەوتنی تایبەتی لە گەڵ بەرێز فەرهاد مخموری ناسراو بە (فەدۆ) پێشمەرگەی ناو سەنگەرەکەی بەری رۆژ هەلات .
٣٠- چاوپێکەوتنی تایبەتی لە گەڵ بەرێز مستەفا گۆرۆنی .
٣١- چاوپێکەوتنی تایبەت لە گەڵ بەرێز دکتۆر سەردار ئەندامی م.س حزبی زەحمەت کێشانی کوردستان و بەرپرس وفەرماندەی هێزی ئەم حزبە لە داستانی کۆرێ .
٣٢- پەرتوکی ژیانی کودێك لە نوسینی بەرێز عمر عسمان .
٣٣- چاوپێکەوتنی تایبەتی لەگەل بەرێز رەشید حەمەدئەمین ناسراو بە رەشید کۆرێ فەرماندەی دەستەیەك پێشمەرگەی یەکێتی لە شەڕی کۆرێ.
٣٤- چاوپێکەوتنی تایبەتی لە گەڵ بەرێز سەید حکمەت پێشمەرگەی بەشداربوو لە داستانی کۆرێ .
٣٥- چاوپێکەوتنی تایبەتی لە گەڵ بەرێز فەرهاد مەخموری پێشمەرگەی بەشداربوو لە داستانی کۆرێ .
٣٦- چاوپێکەوتنی تایبەتی لەگەڵ بەرێز رەشید کۆرێ.

٣٧- نامیلکەی نرکەی کوردستان لە نوسینی ڕێباز ١٩٩٢.

٣٨- چاوپێکەوتنی تایبەتی لەگەڵ بەڕێز دکتۆر سەردار .

٣٩- هەمان سەرچاوەی پێشوو.

٤٠- چاوپێکەوتنی کەی تی ڤی لەیادی دا ستانی کۆرێ لەگەڵ بەڕێز باپیر نیسماعیل پێشمەرگەی ناو سەنگەرێك لە بەری ڕۆژ ئاوا .

٤١- چاوپێکەوتنی کەی تی ڤی لەیادی دا ستانی کۆرێ لەگەڵ بەڕێز محمد میر محمد بەشدار بووی داستانی کۆرێ .

٤٢- گۆڤاری ڕێبەری پێشمەرگە لە بیرەوەری یادی داستانی کۆرێ ژمارە (٤٥) سالی ٢٠٠٣ بەڕێز مەلائیبراهیم نوسیویەتی .

٤٣- چاوپێکەوتنی تایبەتی لەگەڵ بەڕێز محسین یاسین پێشمەرگەو فەرماندەی هێزی پێشمەرگەی حزبی شیوعی لە داستانی کۆرێ .

٤٤- چاوپێکەوتنی گولان تی ڤی لە سالی ١٩٩٨لەیادی داستانی کۆرێ لەگەڵ کانەبی گەورە بەرپرسی سەربازی هێزی پێشمەرگەی حزبی شیوعی لە کۆرێ .

٤٥- چاوپێکەوتنی تایبەتی لەگەڵ بەڕێز نامق سوارە پێشمەرگەی بەشداربووی داستانی کۆرێ .

٤٦- چاوپێکەوتنی تایبەتی لەگەڵ بەڕێز مەلا کمال پێشمەرگەی حزبی سۆشیالیستی کوردستان و بەشداربووی داستانی کۆرێ .

٤٧- چاوپێکەوتنی گولان تی ڤی لەگەل بەڕێز کانەبی گەورە .

٤٨- پەرتوکی بیرەوەری پێشمەرگەیەك لە نوسینی سەید کاکە لاپەرە (٢٥).

٤٩- چاوپێکەوتنی تایبەت لەگەڵ بەڕێز محسین یاسین .

٥٠- چاوپێکەوتنی تایبەت لەگەڵ سەید حکمەت .

٥١- چاوپێکەوتنی کەی تی ڤی لەگەل بەڕێز قادر عسمان ئەندامی سەرکردایەتی حزب اللەی شۆرشگێری کورد ئەو کاتە .

٥٢- چاوپێکەوتنی تایبەت لەگەل بەڕێز مستەفا گۆرۆنی .

٥٣- نامیلکەی کۆرەو وشەرەکانی کۆرێ و دانۆستان - پاشماوەی ڕاپەرین بوو لەنوسینی بەڕێز شوان ڕابەر .

٥٤- چاوپێکەوتنی تایبەت لەگەڵ بەڕێز دکتۆر سەردار.

٥٥- چاوپێکەوتنی تایبەت لەگەڵ بەڕێز سید حکمەت .

٥٦- چاوپێکەوتنی بەڕێز کانەبی گەورە لەگەل گولان تی ڤی.

٥٧- هەمان سەرچاوەی پێشوو.

٥٨- چاوپێکەوتنی تایبەت لەگەڵ بەڕێز محسین یاسین.

٥٩- چاوپێکەوتنی تایبەتی لەگەڵ بەڕێز ڕەشید حمەد ئەمین ناسراو بە ڕەشید کۆرێ.

٦٠- چاوپێکەوتنی تایبەت لەگەل بەڕێز محسین یاسین.

٦١- کریس کوچێرا( بزوتنەوەی نەتەوەیی کوردو ویستی سەربەخۆیی ).لا ١٦٧.

٦٢- ئەتلەسی سیاسی هەرێمی کوردستان لەلایەن بەڕێز فەرید ئەسەسەرد.

٦٣- هەمان سەرچاوەی پێشوو.